وانەی یەکەم:

---

نحو المقدمة، سەرەتای زانستەکە:

پێشەکیەک دەربارەی زانستی نحو وە ڕوونکردنەوەی بنچینەکانی ئەم زانستە:

هەموو زانستێک کۆمەڵە بنچینەیەکی هەیە پێویستە لەسەر فێرخواز کە بیانزانێت پێش دەست پێکردنی وە محمدی کوڕی علی صەدام کە یەکێکە لەزانا بەڕێزەکان کە ئەم بنچینانەی کۆ کردۆتەوە کە دەبنچینەیە لەچەند بەیتە شعرێکا وتوتی.

بەڕاستی بنچینەی هەموو زانستەکان دەدانەیە:

الْحَدُّ[پێناسە],وَالْمَوضُوعُ[بابەتەکانی]،دواتر الْثَّمَرَةْ[بەرووبوومەکەی]{واتا بەروو بوومی زانستەکە}

وَنِسْبَةٌ[دانەپاڵ] ,وَفَضْلُهُ[پلەوپایەی]،وَالْوَاضعْ[دانەرەکەی](واتاکێ دانەرەکەیەتی),

وَالإسْمُ[ناوەکەی]، [هی زانستەکە]،وَالإِسْتِمْدَادُ[زانستەکە لە چییەوە وەرگیراوە]، حُكْمُ الْشَّارِعْ[حوکمی شەریعەت دەربارەی زانستەکە]

مَسَائِلٌ[باسەکانی زانستەکە کە چی لەخۆ دەگرێت], وَالْبَعْضُ بِالْبَعْضِ إِكْتَفَى[ هەندێکیان هەندێکی تریان تەواو دەکەن]،
وەهەرکەسێک هەموو ئەمانە بزانێت ئەوا پلەو پایەو ڕێزی زانستەکەی بەدەست هێناوە.

{{وە بنچینەکانی زانستی نحو}}:

1 [بنچینەی یەکەم]المبدأُ الأو-
حَدُّ النَّحْوِ [پێناسەی زانستی نحو]: لەدەرسەکانی داهاتوو بە درێژی دێینە سەری إن شاء الله، چوونکە تۆزیک لەسەر وەستانی دەوێت.

2
مَوضُوعُ [باسەکانی زانستەکە]: زانستی نحو بەدوای الكلمة[وشەکە]والكلام[وتەکە]دەگەڕێت واتا - وشەو ڕستە و قسەت بۆ باس دەکات لەڕووی ئیعرابو بناء[واتا وشەکەو ڕستەکەو وتەکە معربن یاخود مبنیین](دواتر باسی دەکەین إن شاء الله، بەس جارێ ئەمەنە بزانە شتێکمان

هەیە پێی دەوترێت معرب یەکی تریش هەیە پێی دەوترێت مبنی.)

3
- ثَّمَرَهْ [بەرووبوومی زانستەکە چییە:]تێگەیشتن لە وتە یان قسەی عەڕەبی، وە پاراستنی زمان لە هەڵەکردن.

4-
وَفَضْلُهُ [پلەو پایەو ڕێزی زانستەکە]: مرۆڤ ناگاتە پلەو پایەی اجتهاد کردن{واتا لەشەریعەتدا} بەبێ ئەوەی بەتەواوەتی ئەم زانستە زەبت[جلەو] نەکات یان ڕەوان نەکات، وە نە لە الکتاب[قورئان] والسنة ناتوانین بەتەواوەتی لێیان تێبگەین بەتێگەیشتنێکی ڕێکو درووست بەو زانستە نەبێت، وە بەجێبەجێ کردنی قەواعیدەکانی[یاساو ڕێساکانی] نەبێت، کەواتە ئەوەی هاتووە بەدوای یەکتردا وتەی زانایان لە پیاهەڵدانی وە حەزدان بە فێربوون و بەشوێن داچوونی.

5-
وَنِسْبَةٌ [دانەپاڵ، واتا ئەم زانستە دەدرێتە پاڵ کام لەزانستەکان]: لەزانستەکانی زمانی عەڕەبییە[واتا دەدرێتە پاڵ ئەو]

6-
وَاضِعْ [دانەرەکەی کێیە]: أبو الأسود الدؤلي بأمر[بەفەرمانی]علي بن أبي طالب، على أولى الأقوال[لەسەر درووست ترین و تەواوترین وتەکان]( زۆر وتە هەیە کێ دایناوە بەڵام لەزۆربەی کتێبەکان وا باسیەکەن)]{کە لەدوای ئەوەی خەڵکی خەریک بووە هەڵەبکەن ئەڵێن گوایە ابو اسود دؤلی گوێی لە منداڵەکەی دەبێت وتویەتی }{ما أجمل السماءُ} کە ویستۆتی سەرسامی خۆی دەرببڕێت وە ئەگەر بەو شێوەیە بیلێت دەبێ بلێت[ما أجمل السماءَ]کاتێک ابو اسود دەبینێت کە وتەکەی تێکداوەو هەڵەی کردووە وە دوای ئەوەی بەسەرهاتەکە بۆ ئیمام عەلی دەگێڕێتەوە ئیتر بۆتە هۆکاری دانانی ئەم زانستە کە تا خەڵک هەڵە نەکەن وە هەڵەش تێنەگەن{واتا لەقورئان لە سوننەت یان لە خودی زمانی عەڕەبی}[وەنەوەک خەڵک لەسەر هەڵەکان ڕابێن] وە دەڵێن کە فاعل (بکەر) مرفوعە وە مفعول بە[کار لەسەر کراو]منصوبە، وە مضاف إليه مجرورە، وە بە ابو اسودی وتووە ئەم ڕێگەیە

بگرە بەر هەرلەوێوە زانستەکەیان ناو ناوە زانستی نحو.
(بەسەرهات زۆرە لەسەری)(وەدواتر دەزانن مرفوعو ئەوانی تریش چین إن شاء الله)

7-
إِسْمُ[ناو]: ناوی زانستی نحوە، وە مصدری[چاوگی]نحو چییە؟

[{کاری ڕابردوو}(فعل ماضي) :نَحَى]،

{کاری ڕانەبردوو} (فعل مضارع) :يَنْحُو،

[دواتر باسی دەکەین کە نحو واتا چی ] ({چاوگ} مصدر) :نَحْوًا.

8-
وَالإِسْتِمْدَادُ] لەچیەوە وەرگیراوە]:[}وەرگیراوە لە الكتاب[کە قورئانە] والسنة وە لە قسەی عرب
ئەوەی کە ڕوون و پاراوەو پاک بووە، هۆنراوە بێت یان پەخشان(واتا لەقسەی عەرەب).

9-
حُكْمُ الْشَّارِعْ[حوکمی فێربوونی]: لە فەرزە کیفاییەکانە، ئەگەر هەنێک فێری بوون ئەوا تاوان
لەسەر ئەوانی تر لادەچێت، وە هەندێک جار پێویست دەبێت لەسەر هەندێک لە تاکەکان لەبەر
جیاوازیو جابوونەوەیان لە تێگەیشتن(واتا هەیە ئاسان تر فێرەبێت ئیتر خوێندکاری زانست بێت یان
کاتی باشی لەبەر دەست بێت)، وەهەشە بە پێچەوانەوە.

10-
مَسَائِلٌ[باسەکانی ئەم زانستە]: کە بریتییە لە باسەکانی ئەم زانستە، الفعل[کارەکە]
والفاعل[بکەرەکە]وە ئەو دووەو جگە لەو دووانەش دواتر باسیان دەکەین
إن شاء الله.

---

وانەی دووەم:

---

پێناسەی نحو لُغَةً وَاصْطِلَاحاً لەزمانەوانیو زاراوەدا.

پێناسەی نحو لە لُغَةً [لەزمانەوانیدا][واتا ئەگەر بگەڕێیەوە بۆ قاموس
وَاصْطِلَاحاً[وەلەزاراوەی زانایانی نحو دا چ مانایەکی هەیە:]

①-
النَّحْوُ لُغَةً [نحو لە زماناوانیدا:] حەوت مانای هەیە.

لەومانایانەدا هەمانە:

1-

الْقَصْدُ [مەبەست]، کاتێک دەڵێیت: نَحَوْتُ مَكَّةَ. بەمانای (مەبەست) دێت، واتا تۆ دەڵێیت مەککەم کردە مەبەست.
(واتا نحو لێرەدا بەمانای مەبەست هات.)

2-
المِثْلُ(هاوشێوە یان وەکو] کاتێک دەڵێیت: مُحَمَّدٌ نَحْوُ إِبْرَاهِيْمَ. لێرە بەمانای (وەکو) دێت، واتا موحەممەد وەکو ئیبراهیمە.

3-
المِقْدَارُ [ئەندازە]، کاتێک دەڵێیت: عِنْدِي نَحْوُ مِائَةِ دِينَارٍ. لێرە بەمانای [ئەندازە] دێت، واتا ئەندازەی سەت دینارم لایە.

وە امام داودی بە شعر کۆی کردوونەتەوە

بۆ نحو هەیە حەوت مانا کە لە زمانەوانیدا هاتووە،

کۆمکردوونەتەوە لە تاکە بەیتێک،

قَصْدٌ: مەبەست

مِثْلٌ: وەکو

مِقْدَارٌ: ئەندازە

نَاحِيَةٌ: ڕووگە

نَوْعٌ: جۆر

بَعْضٌ: هەندێک

حَرْفٌ: پیت یان کەنار

نموونەیان بۆ بێنەوە.
②-
وَأَمَّا اصْطِلَاحاً [وە لەزاراوەشدا:] نحو ئەو زانستەیە کە بە کۆمەڵە بنچینەیەک بەهۆیانەوە ئەزانرێت(وەتا بەهۆی بنچینەکانەوە) {ئەی چی دەزانرێت؟}باروودۆخی کۆتایی وشەکان

لەڕووی الإعراب والبناء.

بۆنموونە: يَذْهَبُ مُحَمَّدٌ(موحەممەد دەڕوات), واتا يذهبُ كۆتاييەكەی چی وەردەگرێت؟، وە محمدٌ كۆتاييەكەی چی وەردەگرێت زانستی نحو ئەمەمان پێ دەڵێت.

واتا ئەگەر معرِبە چی حەرەكەیەكی وە ئەگەر مبنییە چی حەرِەكەیەكە

مەبەست لە معرب و منصوب مجرورە كە هێماكانن وەک كەسرە( ِ ) و ئەوانی تریش بەتەنوینەكانیشیانەوە( ٍ ) دواتر دەزانن إن شاء الله.

معرِب: ئەوەیە كە كۆتاییەكەی لەشتێكەوە بۆ شتێكی تر دەگۆڕێت بەهۆی عامل كە شتێک كاری تێ دەكات.

وە مبنی: ئەوەیە كە یەک حاڵەتی هەیە ناگۆڕێت وە هیچ شتێک كاری تێ ناكات.

الكَلِمَةُ [وشە]وَالكَلَامُ [وتە، قسە]لەزمانی عەرەبیدا:

①-
الكَلِمَةُ[وشە]چییە: وتەیەكی مفرەدە (تاكە) دانراوە بۆ مانایەک[بۆنمونە دەڵێیت أَسَد واتا شێر دانراوە بۆ مانایەک كە

ئاژەڵێكەو بۆی دانراوە پێی بڵێی شێر كە ئاژەڵێكی دڕندەیە كە وتمان شێر ئەو ئاژەڵەمان دێتە پێش چاو كە گۆشت خۆرەو دڕندەیە.]

وە كلمە لەزمانی عەرەبی سێ جۆرە

1-
إِسْمٌ{ناو} وەكو: [مُحَمَّدٌ]
2-
فِعْلٌ{كار} وەكو: [ذَهَبَ{ڕۆیشت}]
3-
حَرْفٌ{پیت} وەكو: [مِنْ {لە} یان قَدْ]

إن شاء الله دێینە سەر گشتیان باسیان دەكەین.

②-
وَالكَلَامُ [وتە]چییە: قسەیە چەند شتێكن پێكهاتوون و دراونەتە پاڵ یەک كە شتێكیان پێک

هێناوه یانی چەند شتێکە کە ڕستەیەکی پێک هێناوە یانی یەک وشە نییە وەسودی لێدەبینی(هەر شتێک پێی بوترێت کلام لەزمانی عەرەبیدا دەبی سوودێک بگەیەنێت), کە عەرەب دایناوە کە ڕستەیەکە لێی تێدەگەیت.

1-
مەبەستمان لە لَفْظِ [قسە] چییە:دەنگە، وەلەخۆی گرتووە هەندێک لە الحُرُوْفِ(پیتەکان) ئەوەی کە سەرەتاکەی { ا }کۆتاییەکەی (ي}یانی قسەیە ودەنگە بەکورتی.

2-
التَّرکِیبُ(پێکەوەلکان)چییە: هەنێک لەوشەکان بدرێنە پاڵ هەندێکی تریان، لەوەی کە قسەی پێ تەواو دەکرێت
(بۆنموونە يذهب محمد کە دوو شتن دراونەتە پاڵ یەکتری.)
لەوەی کەوا قسەی پێ تەواو دەکرێت[يذهبُ محمدٌ]

3-
الإِفَادَةُ [سودگەیاندن]: واتا سودێک بدات بەتۆ.

4-
المُرَادَ بِالْوَضْعِ: ئەوەیە کە دانردرابێت لەزمانی عەرەبیدا وە موهمل نەبێت(واتا نابێت بوونی نەبێت لەقاموسی عەرەبیو واتا نەدات) یانی شتەکە دەبێت بوونی هەبێت لەزمانی عەرەبی و لەقاموسەکەیان وەمانا بدات وشەبێ یان هەرچی کە بەرامبەر لێی تێبگات بۆنموونە (کەدەڵێیت يذهب محمد، واتا محمد دەڕوات ئیتر بەرامبەر چاوەڕێی شتی تر ناکات و تێدەگات کە محمد دەڕوات)

نموونەیەکیش کە گشت مەرجەکانی تیایە هی کلام[الْحَمْدُ لِلَّـهِ].

---

وانەی سێیەم:

---

پێناسەی إسم (ناوو) فعل (کارو)حرف (پیت) و نیشانەکانیان.

تعريف الاسم وعلاماته
پێناسەی ناوو نیشانەکانی:

①-
پێناسەی إِسْمُ و نیشانەکانی: دەلالەت دەکات لەسەر ناو نراوێک بۆنموونە[بَیت، کە دەلالەتە لە شتێک چوار دیوارەو سەقفی هەیەو ئیتر ئاوا پێی دەوترێ بيت، خانوو]وشەیەکە گوزارشت

دەکات لە واتای نەفسی خۆیدا, (واتا کە دەڵێی شێر پێویستی بەهیچی تر نییەو واتا دەدات، کە واتا ئاژەڵێکی دڕندەیەو گۆشت خۆرێکە, واتە وەک حرف نییە کە شتی تر واتای تەواو بکات بۆنموونە، مِن {لە}کە واتا نادات بۆیە دەبێ شتێکی تر واتاکەی تەواو بکات، کە بۆنموونە بڵێیت سەردار لە خوارەوەبوو.)وە پەیوەست نییەو نەلکاوە بەزەمانێکەوە یان کاتێکەوە(بەمەش واتا فعل نییە چونکە کار پەیوەستە بەزەماناوەو داهاتوو و ڕابردوو و ڕانەبردوو بۆنموونە دەڵێیت محمد ڕۆیشت ، کە ڕۆیشت کارەکەیە وەتا محمد لەڕابردوو ڕۆیشتووە، یان دەڕوات کە ئەمە یانی بەردەوامەو ڕانەبردووە یان لەداهاتوو دەڕوات، یان بڵێی بڕۆ کە ئەمە فەرمانە.)نموونەش بۆ ناو[محمد، مريم]

وەنیشانەکانی ناو:

1-
دروستبێت حەرفی جڕی بچێتە سەر(بە دڕێژی دێینە سەری کە چین إن شاء الله)
نموونەیەکیش [خَرَجْتُ مِنَ الْمَنْزِلِ ]( هاتمە دەرەوە لە شوێنەکە)المنزل ناوە چونکە (من)ی لەپێشە کە حرف جرە.
جارێ هەر بزانن ئەمانەن حُرُوف الجَّر[فِي - مِنْ - عَنْ - عَلَى - ك - رُبَّ - ب - ل - [ حُرُوف الْقَسَم(پیتەکانی سوێند خواردن). کە ئەمانەن: [ و- ب - ت]

2-
یان تنوین[ ٌ / ً / ٍ ]
بۆ ئەوەی لێتان ئاڵۆز نەبێت تنوین چییە:
ئەمە فەتحەیە [ َ ]کە بوو بەدوان دەبێتە تنوینی فەتحە ئاوا[ ً ]ضەممەو کەسرەکەش ئەینەن شت.
هەر نموونەش لەسەریان[محمدُ- محمدٌ- محمدَ- محمدًا- محمدِ- محمدٍ]واتا ئەگەر تەنوین چۆیە سەر شتێک دەزانیت کە ئەمە ناوە واتا ناو تنوینی دەچێتە سەر.

یاخود وەکو فەرموودەی الله تعالى:
{مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمۡ وَلَـٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَۗ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىۡءٍ عَلِيمًا}
[سورەتی الأحزاب: ٤٠]

3-
یان ال تعریفی بچێتە سەر،، بۆ نموونە البَيت کە واتا خانوەکە، کە ال لەزمانی عەڕەبی بۆ شتێکی ناسراو بەکار دێت بۆنموونە لەکوردیش {ەکە}مان هەیە کە شتەکە ناسراو بێت بەکاری دێنین بۆنموونە دەڵێین خانوو، خانووەکە یان سەیارە، سەیارەکە، بەم شێوازە بۆ شتێکی ناسراو بەکار دێت، وە نیشانەی ناسینەوەی ناویشە. وەوەکو فەرموودەی الله تعالى:

{وَإِلَـٰهُكُمۡ إِلَـٰهٌ وَٰحِدٌۖ لَّآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلرَّحۡمَـٰنُ ٱلرَّحِيمُ}
[سورەتی البقرة: ١٦٣]

4-
وەهەروەها الإِضَافَةِ[مەبەست مضاف و مضاف اليه ـيە] (دانه پاڵ وەربگرێت) بۆنموونه [قَلَمُ مُحَمَّدٍ,قەڵەمی موحەممەد]مادەم محمد وەریگرتووە ببێتە خاوەنی قەڵەمەکە، ئەوا دەڵێین موحەممەد ناوە، چوونکە شتێکمان دایە پاڵیو

وەریگرت. یاخود وەکو فەرموودەی الله تعالی:
{ قَالَ إِنِّى عَبْدُ ٱللَّهِ ءَاتَىٰنِىَ ٱلْكِتَـٰبَ وَجَعَلَنِى نَبِيًّا }
[سورەتی مريم: ٣٠]

5-
یانیش الْنِّدَاءِ [واتا قبوڵییکات یان وەرییگرێت کە بانگی بکەیت]وەک [یا الله]، یاخود فەرموودەی الله تعالی:
{يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعْبُدُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ}
[سورەتی البقرة: ٢١]

6-
یان وَالإِخْبَارِ عَنْهُ (هەواڵی دەربارە بدەیت)[البَيتُ جَمِيلٌ],, ماڵەکە جوانە

وە یاخود فەرموودەی الله تعالی:
{ مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ}
[سورەتی الفتح: ٢٩]
موحەممەد نێردراوی اللهیە، کەواتە موحەممەد ناوە مادەم هەواڵت لێداوە، وە محمدٌ کە دوو , نیشانەی تیایە یەکیان هەواڵدانە ئەوی تر تنوینەکەی.
وەکەواتە دەشکرێ لەو چەند نیشانەیەی باسمان کرد جاری وایە لە یەک نیشانە زیاتری تیابێت.

②-
پێناسەی الفعل(کار): ڕوودانی ڕووداوێک یان کردارێک یان کردنی کارێک, لەلای زانایان وشەیەکە گوزارشت دەکات لەمانایەک لەخودی خۆیدا(تا ئێرە پێناسەی ناوە بەڵام لە حرف جیادەبێتەوە بەڵام کە دەڵێت: گرێدراوە بەیەکێک لەسێ کاتەکە)ئا لێرەوە لە ناویش جیا دەبێتەوە چوونکە ناو نەبەستراوەتەوە بە کاتو زەمانەوە(کە ئەمانەن: [ المَاضِي]

بەڵکو کار پێوەی بەستراوەتەوە [ ڕابردوو[,وَالحَالِ]ئێستا[,وَالإِسْتِقْبَالِ]داهاتوو.

## 1-
## نیشانەکانی ناسینەوەی فعل(کار):

1-
هەر شتێک [قد چۆیە سەرو وەریبگرێت][قَدْ ضَرَبَ]
لێدا. (بۆنێر)

2-
یان حرفی الإسْتِقْبَالِ(داهاتوو)ی بچێتە سەر[س - سَوْفَ]

س:بۆ داهاتووێکی نزیکە[سَيَضْرِبُ]لەداهاتووێکی نزیک لێدەدات

سوف: بۆ داهاتووێکی دوورترە لە س ـکە [سَوْفَ يَضْرِبُ]لەداهاتوو لێدەدات

3-
وە جەوازمەکانی بچێتە سەر[لَمْ يَضْرِبْ]لێ نادات
{دواتر دێینە سەر جوازم إن شاء الله}

4-
وە الضمیر مرفوعی] ضمیر جێناوەکانە إن شاء الله دێینە سەری[بچێتە سەر[ضَرَبْتُ]لێمدا

5-
وە تاء تأنیث ساکنة بچێتە سەر[ضَرَبَتْ]لێدا{بۆ مێ بەکار دێت بەهۆی تْ کەوە}

## 2-
## بەشەکانی فعل سێیە:

1-
الماضی(ڕابردوو)[[گوزارشت دەکات لەزەمانێک کە پێش زەمانی قسەکردنە واتا کارەکە کەکاتێک من قسەدەکەم ڕوویداوە، نموونە ]] أَكَلَ واتا خواردی یانی
پێش ئەوەی من قسەکە بکەم ئەو لەکارەکەی بۆتەوە پێش ئەوەی من بیڵێم کە خواردن بووە.
بۆنموونە دەڵێی سەردار سەت بلۆکی بردە سەربانەکە کە کارەکە ڕوویداوە سەت بلۆکەکە دەبێ لەسەربانەکە بێت.

2-
المضارع (ڕانەبردوو)

گوزارشت دەکات لە الحال(ئێستا) یان الاستقبال (داهاتوو)(يَأْكُلُ) یانی دەخوات یانی یان ئیستا ]
کە قسەکە دەکەم ئەو بەردەوامە لەخواردن یان لەداهاتوو دەخوات، جا بۆ ئەوەی بەدڵنیاییەوە
مەبەستت بگەیەنیت کە بۆ داهاتووتە ئەوا دەتوانیت حرفەکانی داهاتووی بخەیتە سەر نموونە]
سَيَأْكُلُ, یانی دواتر دەخوات].
هێماکانی کاڕی ڕانەبردوو، -<[أ-ن-ى-ت]{أنيت}هەر لەباسی جێناوەکاندا إن شاء الله جوانتر لێی
تێدەگەن کە جیاوازی چییە لەنێوان ئەم چوار پیتە ئەگەر بەکاریان بێنین بۆ نموونە بڵێین

أضرب یان نضرب یان یضرب یان تضرب.

3-
الامر (فەرمان)خواستنی هێنانە دی شتێکە، یان بۆ بەردەوام بوون لەسەر شتەکە(یانی شتەکە هەیە
تۆ داوا دەکەی بەردەوام بێت). نموونە: كُلْ یانی بخۆ، کە لێرە یان لەوەیە کابرا نەخوات تۆ داوا
بکەیت بڵێی بخۆ یان لەوەشە بخوات بەڵام بۆ ئەوەی بڵێی بەردەوام بە لە خواردن تۆ دەڵێیت بخۆ،
واتا بەردەوام بە لەسەر خواردن.
ڕوونکردنەوەی زیاتر دەدەین لەداهاتوو إن شاء الله.

③-
پێناسەی الْحَرْفُ: حرف لە لوغە لە قاموسدا بریتیە لەکەنار،
{وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعۡبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرۡفٖۖ فَإِنۡ أَصَابَهُۥ خَيۡرٌ ٱطۡمَأَنَّ بِهِۦۖ وَإِنۡ أَصَابَتۡهُ فِتۡنَةٌ ٱنقَلَبَ عَلَىٰ
وَجۡهِهِۦ خَسِرَ ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةَۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡخُسۡرَانُ ٱلۡمُبِينُ}
[سورەتی الحج: ١١]
کە واتا لەخەڵکی هەیە لەسەر کەنار الله دەپەرستێت(واتا باوەڕەکەی لاوازە کە لەسەر
ڕۆخەکەیەتی واتا باوەڕەکەی دەڕواو دێتەوە،وە دواتر جوانتر باسیەکات لەئایەتەکە کە چۆنە).

وەلەلایەن زانایانی زاراوە: کەلیمەیەکە گوزارشت دەکات لەغەیری خۆیدا(واتا پێویستی بەغەیری
خۆیەتی تاواتاکەی تەواو بکات واتا تۆ کە دەڵێیت)، ب(بە) کە بە هیچ واتایەک نادات تا بەرامبەر
تێبگات بەجوانی، بەڵام ئەگەر بڵێیت, بە سەیارەکەم ڕزگارم گەیاند، ئەمە واتای دا بەڵام پێویستی
بەغەیری خۆی هەبوو.( وە نەیشلکاوە بەزەمانێکەوە،
کەواتە پێویستیان بەغەیری خۆیانە تا واتایان تەواو بکات).
یاخود وەکو [ب][كَتَبْتُ بِالْقَلَمِ]بەتەنها ب مانای نییە کاتێک لەگەڵ شتێکی تر غەیری خۆی جێگیر
دەکرێت واتا دەدا، کە واتا بە قەڵەمەکە نووسیم، کەواتە بۆمان دەرکەوت واتای ب لە ڕستەکە
لەخودی ڕستەکەدایە، وە ب بەتەنیا گوزارشت ناکا لەواتایەک.

---

وانەی چوارەم

---

## أنواع الإسم (جۆرەکانی ناو)

### جۆرەکانی ناو:

إسم(ناو):بۆ ناو کۆمەڵێک جۆری زۆر هەیە
لەوانەدا

[إِسْمُ الْجِنْسِ، وَالْعَلَمُ، وَالْمُعَربُ وَتَوَابِعُهُ، وَالْمَبْنِيُّ، وَالْمُثَنَّى، وَالْمَجْمُوعُ، وَالْمَعْرِفَةُ، وَالنَّكِرَةُ، وَالْمُذَكَّرُ، وَالْمُؤَنَّثُ، وَالْمُصَغَّرُ، وَالْمَنْسُوبُ، وَأَسمَاءُ الْعَدَدِ، وَالْأَسْمَاءُ الْمُتَّصِلَةُ بِالْأَفْعَالِ]
هەموو ئەم جۆرانە ڕوونکردنەوەیان دێت لەکۆمەڵە فصول ـی سەربەخۆدا إن شاء الله.

①-
إِسْمُ الْجِنْسِ [ئەو ناوەی کە بۆ ڕەگەزە]: ئەو شتەیە کە گوزارشت دەکات لەسەر شتێکی دیاری نەکراو غَيرِ مُعَيَّنٍ[واتا شتێک کە دیاری نەکراوە]. وەکو: رَجُلٍ (پیاو)إِمْرَأَةٍ(ئافرەت)، کە دەڵێیت پیاو یان ئافرەت ڕەگەزی هەرچی ئافرەت و پیاوە دەیگرێتەوە کە وتت پیاو هەرچی پیاوە دەیگرێتەوە، کە وتت ئافرەت هەرچی ئافرەتە دەیگرێتەوە، بەبێ دیاری کردن.

و هو ضَربَانِ{وە ئەویش دوو جۆرە[واتا جۆری اسم الجنس]}:

1-
إِسْمَ عَيْنٍ {ناوێکی دیاری کراو}: ئەو شتەیە کە خۆی ڕاگری خۆیەتی،(یانی خۆی بەخۆی ،)هەڵدەستێت) وە ناودەبرێت بە إِسْمَ عَيْنٍ }ناوێکی دیاری کراو{وەکو رَجُلٍ)پیاو( رَاكِبٍ)سواری هەریەکێک لە رجل وە راکب عاقڵن کە بەخودی خۆیانەوە ڕاوەستاون، )کە دەڵێین عاقڵن مەبەستمان چییە؟) واتا ویستیان هەیە لەگەڵ توانا( کە خۆی بەخۆی هەڵدەستێت وە پێویستی بەشتی تر نییە چونکە ویستو توانای هەیە، چونکە عاقڵە.)

2-
إِسْمَ مَعْنًى [ناوی واتا]: ئەوەیان ڕاوەستاوە بە غەیری خۆیجگەلەخۆی] {واتا خۆی لەخودی خۆیدا هیچ نییە ئەگەر کەسێک پێی هەڵنەستێتو ڕاینەگرێت}. وەکو عِلْمٍ زانست(مَفْهُومٍ (تێگەیشتن)، کە دەڵێی زانست ڕەگەزی هەرچی زانستە دەیگرێتەوە کەواتە

اسم جنسە، بەڵام خۆی بەخۆی هەڵناستێت دەبێت عالمت هەبێت پێی هەڵبستێت(ئەگەر خۆی بەخۆی هەڵستا وەک رجل راکب ئەوا اسمی عینە)، کەواتە هەریەک لە علم لەگەڵ مفهوم خۆیان بەخۆیان هەڵناستن، بەڵکو پێویستیان بەشتێکە لەغەیری خۆیان کە پێیان هەڵبستێت،
وە هی یەکەم الْعَالِمُ(زانا)یەە ، کە تۆ باسی زانست بکەی بەبێ زانا زانست هیچ نییە واتا زانست پێویستی بە غەیری خۆی هەیە پێی هەڵبستێت کە زانایە(چوونکە بەواستەی عالم تۆ

علم دەناسیت.)
وە هی دووەم الْشَّيْءُ واتا ئەو شتەی کە تێگەیشتنی لەسەر وەستاوەو جێگیر بووە، واتا ئەگەر بۆنموونە مرۆڤێک نەبێت کە لە شتێک تێبگات مفهوم کا وجودی هەیە، بەکورتی مفهوم بەبێ شتێک کە پێی هەڵنەستێت هیچ نییە.

②-
وَالْعَلَمُ [نیشانکراو:] ئەوەیە کە گوزارشت دەکات لە یەک تاک لە ڕەگەزەکەی خۆیدا(بۆنموونە ڕەگەزی پیاوو ئافرەتمان خوێند، وە اسم علم گوزارشت دەکات لەیەک دانە لەم ڕەگەزە، یاخود لە ڕەگەزەکانی تریش.)

وەکو [محمد]و[أحمد]یان[فاطمة]و[زینب]. بۆنموونە محمد کە گوزارشت دەکات لە تاکێکی نێرینە یاخود کە دەڵێی فاتمە گوزارشت دەکات لەتاکێکی مێینە، یانی دانەیەکە بەتەنها جگە لەو داخل نابێت، بۆنموونە کە دەڵێیت محمد علی داخل نابێت فاتمە داخل نابێت، هەریەکێ لەمانە گوزارشت دەکات لەسەر تاکێک لەتاکەکانی مرۆڤ.

وهو قِسمَانِ[وە دوو جۆریشە]:

1-
الْعَلَمُ الْمُفْرَدُ[نیشانکراوی تاک]: گوزارشت دەکات لەسەر ناوێکی نیشانکراوی تاک(علم واتا ،ناوێکی نیشانکراو هی مرۆڤە یان وڵات بێت) وەک ناوەکانی پێشوو، محمدو فاتمەو ئەوانی تریش کە دەڵێین محمد یانی تاکێکە لە مقابیلی جمعو مثنی دا نییە ئەم تاکە مەبەستمان وشەکەیە، یانی وشەکە یەک دانەیە.

2-
وَالْعَلَمُ الْمُرَكَّبُ(نیشانکراوی پێکهێنان:) (ئەوەیە کە لە دوو بڕگە پێک هاتووە)کەواتە ئەو ناوەیە کە پێکەوە ترکیب کراون بەیەکێک لەم سێ ترکیبە ترکیب واتا کە

شتێک بەیتە پاڵ شتێکی تر، یانی پێکهێنا|

ئەویش سێ جۆرە:

1-

الْمُرَكَّبُ الْإِضَافِيُّ(پێکهێنانی زیادکردن ): ئەوەیە کە پێکەوەنراون(یانی یەکێکت داوەتە پاڵ ئەوی تریان) بە پێکهێنانی مُضَافِ وَالْمُضَافِ إِلَيْهِ، وەکو: عَبْدِ اللهِ، کە عبدت داوەتە پاڵ اللهوە، وە عبد مضاف ـە)یانی دراوە پاڵە، زیاد کراوە)، وە ناوی الجلالة(الله): مضاف إليه ـييە (واتا زیاد کراوە (بۆی، یان دراوە پاڵە بۆی، یانی لەبەر ئەو شتەکە زیادکراوە کە عبد ـە

2-

الْمُرَكَّبُ الْمَزْجِيّ[پێکهێنانی چەسپاندن]: هەموو دوو وشەیەکە دراونەتە پاڵ یەکتری بە شێوەیەک وایان لێهاتووە کە وەک یەک وشە دەربکەون، وەکو (سِيْبَوَيْهِ)ڕاجیایی هەیە کە ئایا بەمانای ژمارە سی دێت یان بەمانای بۆن دێت وە وشەیەکی فارسیە، یان ویە کە بەمانای هاوار دێت.

3-

الْمُرَكَّبُ الْإِسْنَادِيُّ[پێکهێنانی ڕاگرتن، یان دانەپاڵ:] ناوێکی علم ـە(نیشانکراوە) وەرگیراوە لە الْمُسْنَدِ وَالْمُسْنَدِ إِلَيْهِ(ئادەتەن مەبەست لەم دووە موبتەدائو خەبەرە کە دواتر دەیخوێنین إن شاء الله.)نموونەش: تَأَبَّطَ شَرًّا, (گەر تۆ بەیەکێ بڵێیت تابط شرا تۆ ناوەکەیت بەوە نیشانە کرد کە یانی شتێکی خستە بن

باڵی)کە شەڕە( وەک نیشانەیەک دەبێت بۆی(,وە ڕستەکەی ڕستەیەکی فعلییە(کارە), کە بووە بە ناوێکی علم، نیشانکراو.

③-

وَالْمُعْرَبُ- ئەوەیە کە جوولەی کۆتایی دەگۆڕدرێت بەهۆی جیاوازی عواملەکانی،(کارکەرەکانی یانی ئەو شتەی کارێک دەکات، یان هۆکارەکان) وەکو

[جَاءَ زَيْدٌ {زەید هات}]: [کە زەید لێرە فاعلە(بکەرە)بۆیە مرفوعە]

و[رَأَيتُ زَيْدًا{زەیدم بینی}]: کە لێرەش مفعول بە(کار لەسەر کراو)بۆیە منصوبە]

و[سَلَّمْتُ على زَيدٍ{سەلامم لەسەر زەیدکرد}]: (کە لێرەش على لەپێشیەتی کە حرف جرە بۆیە بۆتە مجرور)[

وەبۆیە ئەگەر سەیری کۆتاییەکانی زەید بکەیت جیاوازن.

کەواتە بۆمان دەرکەوت کە حرکەی کۆتایی زەید گۆڕا گۆڕا بەهۆی گۆڕانی عواملەکان(کارکەرەکان، یان هۆکارەکان)

لەداهاتوو باسیان دەکەین إن شاء الله.

---

وانەی پێنجەم

الإعراف, المرفوعات، فاعل، المعرب

④-
الاعراب(:ئاشکراکردن)، بۆیە پێیەوترێت ئاشکرا کردن چوونکە بەئەو مانا ئاشکراو ڕوون دەبێتەوا): بریتیە لەجۆراو جۆری حەرەکەی(جوولەی)کۆتایی وشە بەجیاوازی عوامل(عامل، یانی بەهۆی جیاوازی ئەو عاملانە یان ئەو هۆکارانەی دەچنە سەری) یان بە ظاهرة (ئاشکرا)دەردەکەوێ یان دەرناکەوێت،
وەکو [قال محمدٌ]دەرکەوتوە کەواتە ظاهرة[بەلام [قال مُوسَی]:]دەرنەکەوتوە چونکە ناگونجێ بەلام هەر لەسەری حیسابە ، وە مرفوعە چوونکە هەردووکیان فاعلن [بکەرن]. وە هەرشتێک وەک موسی عیسی، ئاوا دەڵێین وشەکە تیایدا موقەدەرە واتا تقدیر کراوە بۆی، یانی بۆ محمدٌ چیمان دانا بۆ موسی ـاش ئەوەمان دادەنا بەلام ناگوونجێ،وەبەلام هەر لەسەری حیسابە کە مرفوعە چوونکە بکەرە. ]

1-
جۆرەکانی الإعراب چوارە: [رَفْعٌ،وَنَصْبٌ،وَجَرٌ,وَجَزْمٌ]

1-
اسم ناو: چی وەردەگرێت؟ : [رفع-ونصب-وجر- وەردەگرێ بەلام جزم بۆ اسم نیە چونکە تایبەتە بە افعال، واتا اسم مجزوم نابێت.]

2-
بۆ فعل(افعال)(کار:)ئەی ئەو چی وەردەگرێت؟: [رفع-ونصب-وجزم- بەلام ئەویش جر وەرناگرێ چونکە تایبەتە بە اسم، کەواتە فعل مجرور نابێت]
کەواتە بۆمان دەرکەوت کە ناو مجزوم نابێت، وە کاریش مجرور نابێت.

نیشانەکانی الإعراب:

1-
نیشانەکان بۆ رفع{مرفوع} (الضمة)(ثُ ٌ )نموونە
محمد هات( جَاءَ مُحَمَّدٌ).

یاخود فەرموودەی تعالی:{ ٱلَّذِی لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَـٰوَ ٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَٱللَّـهُ عَلَىٰ كُلِّ شَیۡءࣲ شَهِیدٌ }

[سورەتی البروج: ٩]

2-
بۆ نصب{منصوب} [الفتحة (تـً) ][{ أَكْرَمْتُ عَلِيًّا}

یاخود فەرموودەی تعالی: {إِنَّ ٱللَّـهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا}
[سورەتی النساء: ٢٣]

3-
بۆ جر{مجرور} [الكسرة (تـٍ) ]: { سُعِدْتُ بِبَكْرٍ}
یاخود فەرموودەی تعالی: { وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ }
[سورەتی الفلق: ٣]

4-
[ {بۆ الجزم}مجزوم{[السكون (تْ) بەڵام بۆ اسم نابێت بەس هەر بزانە کە سکون بۆ جزمە
نموونەش فەرموودەی تعالی: {لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ}
[سورەتی الإخلاص: ٣].

تێبینی: ئەسڵ لە الاعراب[ئاشکراکردن]دا ئەو سێ حەرەکەیە(واتا ئەسڵ لە حرکات ئـەوەیە ئەو سێ حرکەیە دابنێیت ، بۆنموونە دەڵێی مرفوع نیشانەکەی ضەممەیە یان منصوب نیشانەکەی فەتحەیە ئەوانی تریش.) بەڵام هەندێک جار نیشانەی ئیعراب بە حرفە(پیتە) لەجیاتی حرکە بەو سێ خاڵە باسمانکرد هەنێک جار نیشانەی الاعراف بە حەرفە(حروف) لە جیاتی حرکات [یانی بۆنموونە لە
{جَاَءَ مُحَمَّدٌ} لەجیاتی الضمة ( ٌ )شتێکی تر دادەنرێ وە کسرەو فتە و نمونەکانی تری ئەینەن شت باس دەکرێ کە لەبریان شتی تر دادەنرێن، إن شاء الله تعالی
هەر نموونەیەک بۆنموونە:
{ وَزَكَرِيَّا وَيَحْيَىٰ وَعِيسَىٰ وَإِلْيَاسَ ۖ كُلٌّ مِّنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ }
[سورەتی الأنعام: ٨٥]
کە [من] حرف جرە وە ناوی دوای خۆی دەکاتە مجرور بەڵام ئەو جارە بەحرکە نەیکردووە بەڵکو بە حرف کردۆتی کە [ین] ـەکە هەون هەر بۆ بەرچاو ڕوونیتان کە هاتینە سەری تا بیناسنەوە مەبەستمان چیبوو إن شاء الله.

تێبینیەکی تر: ئەو ناوانەی کە قورسە ئەو حەرەکانیە زمەو فەتحەو کسرەی لەسەر دەرکەوێ ئەوە نایئوسی وەک و
{موسی -عیسی}کە قورسە حەرەکەکەی کۆتایی دەرکەوێ بۆیە دەرناکەوێ لەکۆتاییەکەی ئەو ناوە وە هەرچیش لەو ناوانە دەچن.

مرفوعەکان چیین(واتا ئەو شتانە چین کە مرفوعن:

①-
 الْمَرْفُوعَاتُ: مەرفوعەکان دوو جۆرن یەکیان ئەسڵیە(بنەڕەتییە) یەکی تریشیان پاشکۆی ئەسڵەکەیە وە ئەسڵ لە مرفوع دا فاعلە(بکەرە، کەواتە ئەوانی تر گشتیان پاشکۆی بکەرن وەهەنێک لە ئەهلی علم دەڵێن ئەسڵ مبتدأ)بەڵام ئێمە وای وەرەگرین کە بکەرەکە ئەسڵییەتی.

1-
الْفَاعِلُ[بکەرەکە:]ئەو ناوە مرفوعەیە کە دراوەتە پاڵی ئەوەی کە پێشی کەوتووە لە فعل(واتا ئەو کارە یان کردارەی کە ڕووی داوە ئەو بکەریەتی بۆنموونە [ذَهَبَ زَيْدٌزەید ڕۆیشت]کە ذهب کارەکەیە ئەی کێ بکەری ئەو کارەیە واتا کێ ڕۆیشت کێ هەستا بەکردنی کاری ڕۆیشتن؟: زەید کەواتە زەید بکەرەکەیە.[ یان شبهِ فعل(هاوشێوەی کار) کە ئەمانەن ئەو ناوانەی متصلن بە فعلەوە[ المَصْدَرُ- وَاسْمَاَ الفَاعِلِ- وَالمَفْعُولِ- وَالصِّفَةُ المُشَبَّهَةُ- وَأَفْعَلَ ]

التَّفْضِيلِ]
 یانی اسمێکی مرفوعە کە لەپێشیەوە هاتووە دەدرێتە پاڵ ئەو وە ئەو فاعل(بکەر)ی ئەو فعلەیە(کار)بەس ئەوەنە بزانە کە ئەو کردارەی ڕوویداوە ئەو بکەریەتی وە ئەو فاعلی ئەو پێنج شتەیە نوسیمان وە لەپێش فاعلەوە دێن یان فعلێک لەپێشیەوە دێت کە واتا ئەو بکەری ئەو شتانەیە واتا ئەو هەستاوە بەکردنی ئەوشتانە(پێنج ڕەنگ زەردەکە) کە ئەو پێنج شتەیە نوسیمان وە بەکورتی واتا ئەو پێنج شتە بەڵگەن لەسەر کردارێک واتا کە کردارێک ڕوویداوە چوونکە هەریەکێک لەوان واتای کاری تیایە، وە فعلیش دیارە کە هەر خودی خۆی کردارە(کەواتە کە کردارت هەیە پێویستت بە کەسێکە بکەر بێت، چوونکە کردار بێ بکەر نابێت)، بەس ناویان بزانە دواتر باسیان دەکەین(هی پێنج شتەکەی سەرێ کە ڕەنگی زەردە) إن شاء الله.

{وە فاعلیش دووجۆرە}:

1-
مُظْهَرٌ (دیار-ناسراو-ئاشکرا): یانی ئەوەی کە بەئاشکرا دەردەکەوێت یانی ناوێکی دیارە یانی ناوەکە دیارە وەک زید(جَاءَ زَيْدٌ)کە زەید ناوێکی دیارە دەزانیت کە زەید هاتووەو کێشە.

جاء: فعل(کارە)

زید: فاعل(بکەرە)

2-
وَمُضْمَرٌ(ڕاناوە): یانی شتێک لەجیاتی ناوەکە بەکار هاتووە، نموونە:
وەکو: تُ(لە ضمیرەکان جێناوەکان باسیەکەین گشت جێناوەکان إن شاء الله)

(عَلَّمْتُ مُحَمَّدًا){محمدم فێر کرد}(کە لەزمانی خۆشمان م ئەو تُ ـئەی زمانی عەڕەبی دەکاتەوە.)

عَلَّمَ: کارەکەیە

ئەی کێ هەڵستاوە بەکردنی ئەو کارە؟:

تُ: فاعل ـە(بکەرەکەیە){کەبۆ خۆم دەگەڕێتەوە})[کەواتە تُ بکەرەکەبوو ئەی ئەو بکەرە کاری لەسەر کێ کردووە یانی کێی فێر کردووە یان کێ کار لەسەر کراوەکەیە؟:

محمدًا: مفعول بە(کاری لەسەر کراوە) واتا کرداری فێرکردنەکە لەسەر محمد جێبەجێ کراوە

کەواتە مفعول بە یە(کەواتە محمد ئەو کەسەیە کە کاری لەسەر کراوە لەلایەن منەوە کە من هەستام بەکردنی کاری عَلَّمَ فێرکردن بەو هۆیەوە بوومە بکەر وە من ئەو کارەم لەسەر محمد جێبەجێ کرد کە محمدم فێرکرد وەئەویش بەو هۆیەوە بۆیە کار لەسەر کراو.)

---

وانەی شەشەم:

وَالْمُلحَقُ بِهِ خَمْسَةٌ

وَالْمُلحَقُ بِهِ خَمْسَةٌ : ئەوانەی دەلکێنرێ بە فاعل(کۆمەڵە شتێکی تر مرفوعەو دەلکێنرێ بە فاعلەوە واتا پاشکۆی فاعلن) پێنج دانەن ئەوانەی پاشکۆی فاعلن:

1-
الْمُبْتَدَأُ وَالْخَبَرُ: یانی ناوێک دەهێنی وە هەواڵێکی لێدەدەین(المبتدأ) : واتا ناوەکەی لەسەرەتا هێناوتە وە هەواڵی لێدەدرێت نموونە(الأرضُ العظيةٌ) وە الخبر: هەواڵ دانە لەو ناوەی سەرەتا (مبتدأ ەکە کە هێناوتە،وە دوو اسمی مرفوعن وەتا مبتدا و خبر هەردووک ناوێکی مرفوعن، کەواتە موبتەدا ئەو ناوەیە مەرفوعە بە ابتداء، وە خبر مرفوعە بە موبتەدا(عامل لەخەبەردا کێ کاری لە خەبەر کردووە یان ئەی خەبەر بۆ مەرفوعە کێ کاری لە خبر کردووە کە موبتەدا کە بۆیەش مەرفوعە)

نموونە:

{اللَّـهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ}
الزمر:62
کە لێرە ناوی اللە‌ی هێناوە وە هەواڵێکیشی لێ داوە کە درووستکەری هەموو شتێکە، کەواتە اللە موبتەدائەو خالق خەبەرەکەیەتی.

{مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّـهِ}
الفتح:29
وە لێرەش ناوی محمدی هێناوە و هەواڵێکی لەسەری داوە کە رسولی اللە‌یە، کەواتە محمد موبتەدائەو رسول
خبرە.

1-
موبتەدا ئەو ناوەیە ک قسەکەت پێی دەست پێ کردووە،

2-
وە خەبەر ناوی دووەمە دوای ئەوەوە دێت(موبتەدائەکە)کە هەواڵمان دەداتێ لەبارەی ناوی یەکەم(مبتەدائەکە)

1
-وە حەقی موبتەدا ئەوەیە کە مەعرفە بێت(ناسراو بێت-زانراو بێت نابێت نکرە بێت یانی-نەناسراو بێت[تۆ کە شتێک نەیناسیت چۆن هەواڵی لەسەر دەدەیت] ،لەهەنێ حاڵەت نەبێت کە ئەویش لە مەعرفەی نزیک دەکاتەوە بۆیە درووستە حوکمی لەسەر بەیت،بەڵام لەئێستا بزانە دەبێ معرفە بێت])

2-
وە حەقی خەبەریش ئەوەیە کە نکرة بێت(نەناسراو بێت)[ هەندێک جار لەوە لادەدەیت لەبەر هەندێک مەبەست][ یانی جاری وایە کە خەبەرەکە دەکرێت بە مەعرفە}

وە خەبەر دوو جۆرە: یان مفرەدە(تاکە) یان جوملەیە(ڕستەیە:)

1-
موفرەد وەک دوو نمونەکەی پێشوو کە ڕۆیشتن.

[کە جوملە نەبوون یان شبە جوملە نەبوون کە ئەو دووە باسی دەکەین ئێستا]

2-
وە جوملە (رستە)وەک ئەو نموونەیە
{اللَّـهُ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَنْ يَشَاءُ وَيَقْدِرُ} الرعد: 26

يبسط فعلەو بەوە دەزانیت مفرد نییە چونکە خەبەری مفرد ئەوەیە اسمبێت بڵام ئەمە فعلە بۆیە جوملەییە
الله لێرە موبتەدائە وە يبسط جوملەیەکی فعلیە لە محل رفع دا، جوملە ئیعراب ناکرێت یانی ناڵێیت جوملەی مرفوعە یان منصوبە ئەوانی تریش هەمیشە کە جوووملە بوو دەڵێین لە محل فلاندایە، وە يبسط لەجێی خبردا دانیشتووە کە خەبەریش مرفوعە، کەواتە دەڵێین ئەو جوملەیە لە محل رفعدا دادەنیشێت کە خەبەرە بۆ الله. وە شتێکی تر بزانە کە يبسط فاعلەکەی هو یە یانی ئەو فروانی دەکات یان ئەگەر نسبط بوو فاعلەکەی نحن وە یانی ئێمە فراوانی دەکەین یان ئەگەر تبسط بوو فاعلەکەی انت یە یانی تۆ فراوانی دەکەیت ئێستا ناکرێ گشت جێناوەکان بنووسین چوونکە زۆرن لەدەرسی جێناوەکان کە گەیشتینێ خۆتان ئەوانی تریش ئاوا لێک بدەنەوە ئەوە بەس بۆ بەرچاو ڕوونیتان بوو.

يبسط: جملة فعلية تكون خبرا لاسم الله: ڕستەیەکی فعلیە دەبێتە خبر بۆ ناوی الله

تێبینیـ: هەنێ جار خبر دەبێتە شبە جملة: شبە جملە چییە دوو بەشە یەکەمیان:

1-
بریتیە لە جار مجرور( مەبەستی حەرفە جرەکان و اسمی مجرورە)

نموونە: {زَيْدٌ فِي الْدَّارِ}
زەید لەناو خانوەکەیە,
کە لێرە دەزانین ناوێکمان هەیە کە زەیدە وە هەواڵێکمان لێداوە کە لەناو خانوەکەدایە کەواتە موبتەداو خەبەرمان هەیە چوونکە تۆ باسی زەید دەکەیت و ناویت هێناوەو هەواڵێکت لێداوە، بەڵام کە سەیرەکەین فی الدار وەک رسول یان خالق ـەکە نەبوو، کەواتە هەرجارێک حرف جرێک لەگەڵ ناوە مجرورەکەدا هات دەڵێین جارو مجرورن واتا شبە جملەن،کە لە محل رفعدا دەبنە خەبەر، وەک جوملە فعلیەکە،

[فی الدار: دەبێتە خەبەر بۆ مبتدائەکە لە محل رفع دا کە هەردووک جارو مجرورن] [فی: جارە]

[الدار: اسم مجروره] ئەودانە شبەجملەن یانی جارو مجرورن(واتا شێوەی لە شێوەی جوملە دەچێت)، وە هەر ناوێکیش حرف جری لەپێش بێت ئەوا دەبێتە مجرور کە دەبینین الدارِ بۆتە مجرور.

2-
الظرف: ئاڕاستەکان و ئاماژەکان وەک[لەپێش لەدوا لەسەر لەبن لەڕاست لەچەپ لەناو لەدەر لەلای تۆ لای من لای ئەو(فوق-تحت- عند- هتد..) هتد..گشتیان الظرفن، ظرف بریتیە لەمانە

نموونە: {مُحَمَّدٌ أَمَامَكَ}
محمد لەپێشی تۆیە کە
لێرە امامک مان هەیە کە لەپێشە ئەو ک جێناوە بۆتۆ کە لەپێشی تۆیە، کەواتە ئەو وشەی لەپێشتە دەڵێیت شبە جملەیە چونکە ظرفە،

هەرکاتێک لەدوای موبتەدائدا الظرف هات ئەوا شبە جملەن لە محل رفع دا دەبنە خبر بۆ موبتەدائەکە.

ئەوەش ئیعرابەکانیان:

(١) فَاسْمُ الجَلَالَةِ (اللهُ)، مُبْتَدَأٌ مَرْفُوعٌ وَعَلَامَةُ رَفْعِهِ الضَّمَّةُ، وَ(خَالِق) خَبَرُهُ مَرْفُوعٌ وَعَلَامَةُ رَفْعِهِ الضَّمَّةُ. وَفِي المِثَالِ الثَّانِي كَلِمَةُ (مُحمَّد)، مُبْتَدَأٌ مَرْفُوعٌ، وَ(رَسُول) خَبَرُهُ المَرْفُوعُ.

(٢) فَـ(يَبسُطُ) مَعَ فَاعِلِهِ (هُوَ) الرَّاجِعِ إِلَى اِسْمِ الجَلَالَةِ، جُمْلَةٌ فِعْلِيَّةٌ تكونُ خَبَرًا لِاسْمِ الجَلَالَةِ (الله).

(٣) فَكُلٌّ مِنْ (فِي الدَّارِ)، وَ(أَمَامَكَ) شِبْهُ جُمْلَةٍ فِي مَحَلِّ رَفْعٍ خَبَـرٌ.

وە با هەر ظروفەکان بزانین:

1-
،ومن ظروف الزمان: "اليَوْمَ، أمسِ، غَدًا، اللَّيْلَةَ، سَحَرًا، غُدْوَةً، بُكْرَةً، حِينًا، وَقْتًا، أَمَدًا، أَبَدًا عَتْمَةً، مَسَاءً، صَبَاحًا".

2-
ومن ظروف المكان: "أَمامَ، قُدَّامَ، خَلْفَ، وَرَاءَ، فَوْقَ، تَحْتَ، عِنْدَ، إزاءَ، تِلْقَاءَ، حِذَاءَ، ثَمَّ، هُنَا".

تێبینی: هەندێک جار خبر پێش موبتەدا دەکەوێت لەبەر هەنێک هۆکار: نموونە {مُنْطَلِقٌ زَيْدٌ}
چۆن دەزانین ئێمە وتمان کە موبتەدا هەرگیز نابێت نەکیرە بێت کەچی لێرە نەکیرەیە، کەواتە ئەوە موبتەدا نییە بەڵکو زەید موبتەدائە،
منطلق خەبەرەو پێش زید کەوتوە کە موبتەدائە،
وە لێیە وتمان مبتدا لەیەکەم دێت بەڵام لێرە منطلق هاتۆتە یەکەم بۆیە ناڵێین مبتدائە وە وتمان نابێت مبتەدائ نکرە بێت بۆیە زید دەبێتە مبتدا وە منطلق خەبەرەو پێش کەوتوە,, زید ناوێکی معرفەیە بڵام منطلق ناوێکی معرفە نییە ئەی باشە بۆ پێش کەوتووە خبر پێشی مبتدا کەوتوە؟ کەوتمان بۆ هەنێک هۆکار، کە لەوانەیە هۆکارێک ئەوە بێت کابرا زەید دەناسێت یانی ئەوکەسەی هەواڵەکەی پێدەدەیت زەید دەناسێت بەڵام نازانێت زەید چی بەسەر هاتووە کە خبر پێشەخات بۆ ئەوەی ئەو شتە بزانێ، یانی بزانێت منطلق(دەرچووە) بووە؟ یانی ئەو دەزانێت زەید شتێکی کردوە یان شتەکە دەربارەی زەیدە یان دەیناسێت، بەڵام نازانێت زەید چی کردوە بۆ ئەوەی کە بزانێت بۆی پێش دەخەیت.

تێبینی: درووستە یەکێکیان بسڕدرێتەوە(یان موبتەدا یان خبر} یەک دانەیان بهێڵدرێتەوە کاتێک کە لە ڕستەو قسەکە تێک نەچێت وەشتێک هەبێت ئاماژەی بۆ بکات.
وەک {فَصَبْرٌ جَمِيلٌ} یوسف:18
واتا ئارامگرتنێکی جوان، لێرە گەر بڵێی صبرِي صبرٌ جميلٌ، لێرە دەڵێی ئارامگرتنی من ئارامگرتنێکی جوانە، کەواتە صبري موبتەدایەو وە پێویستی خەبەرێکی لێ بدەیت، صبر جميل کە ئەوە بۆیە هەواڵ بۆی، یاخود عندِي صبرٌ جميلٌ، وشەی عندي، عند:ظرفە، کە وتمان خەبەر هەنێک کات شبە جملەن کە زەرفیش شبە جملەیە، کەواتە عندي خەبەرە، صبر موبتەدائە، کەواتە ئارامگرتن نەکیرەیە ال پێوە نییە خۆ وتمان نابێ نکرە بێت بەڵام وتمان هەنێ حاڵەت نەبێت کە یەکێکیان ئەوەیە کە وەسفێک بکرێت کەوەسف کرا لە معرفەی نزیک دەکاتەوە کە جميل وەسفی صبر کردووە.
خۆی صبري صبر جميل بووە بەڵام صبري لادراوە کە موبتەدا بووە,, وە ئێستا صبر موبتەدائە کە نکرەیە نەیوتوە الصبر وتمان نابێت نکرە بێت بەس وتمان هەنێ کات درووستە یەکیان ئەگەر موبتەدائەکە وەسف کرا لە معرفەی نزیک دەکاتەوە بۆیە درووستە لەوکاتە موبتەدا نکرە بێت.

---

وانەی حەفتەم:

اِسمُ كَانَ وخَبَر إِنَّ وَأَخَوَاتهما

ئێستاش دێینە سەر ملحقەقەکانی تری فاعل پاشکۆکانی تری بکەر کە وتمان پێنجا ئێستاش کاتی دووەمیانە:

②-
اِسمُ كَانَ وَأَخَوَاتِهَا(ناوی کانەو خوشکەکانی:) کان ناوی یەکەم مرفوع دەکات وە الخبر هەواڵەکە منصوب دەکات، وەکو وتەی تعالی: {وَكَانَ ٱللَّـهُ عَلِيمًا حَكِيمًا}
[سورەتی النساء: ١٧]

گەر سەیر بکەی کانَ هاتووە، کە اللهُ ی مرفوع کردووە کە ئەوە اسمی کانەیە(واتە اللهُ لێرە اسمی کانەیە بەڵام بۆ ڕێز بۆ ناوەکەی وا جوانترە بڵێین اسمی جلالة یە) وە خەبەرەکەشی منصوبە کە علیماً،

ئیعرابی کان ەش دەڵێین: فعل ماض ناقص مبني على الفتحة، ئیعرابی کان هەمیشە بەم شێوەیەیە، کارێکی ڕابردووە ناقصە(واتا تام نییە کە تام کاری ڕابردوو ڕانەبردوو فەرمانی لێ بنیاد دەندرێت کەخۆی کۆمەڵێ فعلمان هەیە ناقص، جامد، تام، ناقص ئەوەیە کە هەموو شتەکانی لێ دروست ناکرێت هەموو سیغەو شیقاقەکان، جامد ئەوەیە کە هیچکامیانی لێ درووست ناکرێت).(منبیە لەسەر فتحە یانی هەمیشە فەتحەی هەیەو ناگۆڕێت(کەوتمان مبنی واتا ناگۆڕێت) {دواتر باشتر باسیەکەین إن شاء الله.}

③-
خبر إِنَّ وَأَخَوَاتِهَا(ناوی إن ـەو خوشکەکانی)(کە دیارە لە حروف مشبە بالفعل ـن,دێینە سەریان إن شاء الله): إن پێچەوانەی کان ـەیە، یەکەم ناو منصوب دەکات، وە خەبەرەکە مرفوع دەکات(کەواتە إن اسمەکەی منصوبەو خەبەرەکەی مرفوعە)وەکو وتەی تعالی:
{إِنَّ ٱللَّـهَ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ}
[سورەتی البقرة: ١١٥]
کە دەبینین ناوەکە کە ناوی اللهَ یە فەتحەی وەرگرتووە واتا منصوبە، وە خەبەرەکەی کە وَٰسِعٌ مرفوعە.

وە ئیعرابی
إن: حرف مشبە بالفعل مبنی على الفتحة(پیتێکە لە کار دەچێ هەمیشە مەبنیە لەسەر فەتحە) اسمی إن چییە کە اللهَ یە: منصوبە لەبەر ئەوەی اسمی إن ـەیە،
وە وَٰسِعٌ: خبر إن ـیەو مرفوعە.

:وە ئیعرابەکانیشیان

(١) فَقَوْلُنَا: (زَيدٌ مُنْطَلِقٌ)، إِخْبَارٌ لِمَنْ يَجْهَلُ انْطِلاَقَ زَيْدٍ، وَقَوْلُنَا (مُنْطَلِقٌ زَيْدٌ) إِخْبَارٌ لِمَنْ يَعْرِفُ زَيْدًا وَيُنْكِرُ انْطِلَاقَهُ، فَتَقْدِيمُهُ اهْتِمَامٌ بِالتَّعرِيفِ بِانْطِلَاقِهِ. (أ.د محمَّد حَسَن).

(٢) فقولُهُ تَعَالَى: (فَصَبْرٌ جَمِيلٌ) يَجُوزُ أَنْ يَكُونَ «صبرٌ» مبتدأً وَالخَبَرُ مَحذُوفٌ، والمعنى: (عِنْدِي صَبْرٌ جَمِيلٌ). وَجَازَ الابتِدَاءُ بِقَوْلِهِ: صَبرٌ جَمِيلٌ، وَهُوَ نَكِرَةٌ؛ لأنها قد وُصِفتْ، والنَّكِرةُ إذا وُصفتْ جازَ الابتدَاءُ بِهَا، وَيَجوزُ أنْ يكونَ «صبرٌ جميلٌ» خبرًا، والمبتدأ مَحذوفٌ، والتقديرُ: فَأمري صبرٌ جميلٌ.. (أ.د محمَّد حَسَن).

(٣) كَانَ: فِعْلٌ مَاضٍ نَاقِصٌ مَبنِيٌّ عَلَى الفَتْحَةِ. اللهُ: اسْمُ الجَلاَلَةِ مَرْفُوعٌ؛ لأَنَّهُ اسْمُ (كَانَ). عَلِيمًا: خَبَرُ (كَانَ) مَنْصُوبٌ.

(٤) إِنَّ: حَرْفٌ مُشَبَّهٌ بِالفِعْلِ مَبْنِيٌّ عَلَى الفَتْحَةِ. اللهَ: اسْمُ الجَلاَلَةِ مَنْصُوبٌ؛ لأَنَّهُ اسْمُ (إِنَّ). وَاسِعٌ: خَبَرُ (إِنَّ) مَرْفُوعٌ.

④-
خَبَرُ (لَا) الَّتِي لِنَفِي الْجِنْسِ,(هەواڵی لا ئەو لا یەیە کە بۆ نەفی جنسە(واتا ڕەگەز}{واتا ڕەگەزێکی پێ نەفی دەکەیت}[ بۆنموونە کە دەڵێیت لا رَجُلَ فِي الدَّارِ، واتا ئەوەی ڕەگەزی پیاو بێت لەو خانوەدا نییە ئەکرێ ئافرەتی تیابێت یان مناڵێک بەڵام ئەوەی جنسی پیاو بێت تیای نییە] : ناوەکەی (ناوی لا)هەمیشە مبنییە لەسەر فەتحە(لێمان تێک نەچێت نابێت بڵێین منصوبە بەڵکو دەڵێین مبنییە لەسەر فەتحە}، وخەبەرەکەشی مرفوعە، وەکو
{لَا رَجُلَ أَفْضَلُ مِنْكَ} [هیچ پیاوێک لەتۆ باشتر نییە]

لا یەکە: لای نافیە بۆ جنس هەمیشە مەبنییە لەسەر سکون، ئەو لا یەیە کە نەفی یەک ڕەگەز دەکات.

رَجُلَ: اسمی لا یە مەبنییە لەسەر فەتحە.

أَفْضَلُ یش: خەبەری لا یە مرفوعە.

⑤-

اسم (مَا) وە(لَا)[ناوی ما لەگەڵ لا:] هەمان کاری لَيْسَ دەکەن،(ئیشەکە چییە؟) هەردووکیان ناوەکە مرفوع دەکەن، وە خەبەریش منصوب دەکەن، وەکو(کان ـەو خوشکەکانی کانەن)

نموونە:

[مَا زَيْدٌ قَائِماً]
(زەید بە پێوە نییە)
[لَا أَحَدٌ أَفْضَلَ مِنْكَ]
(کەس لەتۆ باشتر نییە)

ما: کاری لیس دەکات(هەمیشە ئیعرابی ئەو جۆرە ما یە بەم شێوەیە دەکەیت)، مبنییە لەسەر سکون(ما یان لا) ئەو (ا) سکونی هەیە.

زَيْدٌ چییە؟: ناوی ما ـیەو مرفوعە

ئەی قَائِماً؟: خەبەرەکەیەتی و مەنصوبە

تێبینی: نەفی کردن بە (ما)واتا تۆ هەرشتێک کە بە ما نەفی بکەیت یان للحال(بۆ ئێستایە) یان بۆ الاستقبال (داهاتووە),
وە بەڵام بە (لا) بۆ داهاتووە بەڵام بۆ ئێستا نییە.

وەئیعرابەکانیان:

(١) نَقْصِدُ بِالجِنْسِ جِنْسَ الشَّيْءِ الـمَذكُورِ، إِذَا قُلْتَ (لَا رَجُلَ فِي الدَّارِ)، تَنْفِي وجُودَ جِنْسِ الرَّجُلِ.

(٢) لَا: النَّافِيَةُ للجِنْسِ مَبْنِيَّةٌ عَلَى السُّكُونِ. رَجُلَ: اسْمُ (لَا) مَبْنِيٌّ عَلَى الفَتْحَةِ. أَفْضَلُ: خَبَرُ (لَا) مَرْفُوعٌ.

(٣) مَا: عَامِلَةٌ عَمَلَ (لَيْسَ) مَبْنِيَّةٌ عَلَى السُّكُونِ. زَيْدٌ: اسْمُ (مَا) مَرْفُوعٌ. قَائِـماً: خَبَـرُ (مَا) مَنْصُوبٌ.

(٤) لَا: عَامِلَةٌ عَمَلَ (لَيْسَ) مَبْنِيَّةٌ عَلَى السُّكُونِ. أَحَدٌ: اسْمُ (لَا) مَرْفُوعٌ. قَائِـماً: خَبَـرُ (لَا) مَنْصُوبٌ.

---

وانەی هەشتەم

مەنصوبەکان دوو بەشن: أَصْلٌ(ئەسڵەکەی کە مفعولەکانە{ , وَمُلْحَقٌ بِهِ}هەنێ شتی تر کە پاشۆن بۆ ئەسڵەکە,)
وە أصل بریتیە لە پێنج مەفعولەکە:

①-
الْمَفْعُولُ بِهِ]کار لەسەر کراو{واتا فعلەکە لەسەر ئەو جێبەجێ دەبێت] ]: بریتیە لەو ناوە مەنسوبەی ،کە کاری بکەر لەسەر ئەو جێبەجێ بووە)(یانی بکەرەکە کارەکەی لەسەر ئەو جێبەجێ کردووە)

وەکو: [أَكْرَمَ زَيْدٌ عَمْرًا]
کە دەڵێیت زەید ڕێزی لەعەمر نا کە ڕێزلێنانمان هەیە کارێکە فعلێکە وە زەید هەستاوە بەکردنی کارەکەو بۆتە فاعل وە ئەی کێ کارەکەی لەسەر جێ بەجێ بووە؟ یانی زەید کارەکەی لەسەر کێ جێبەجێ کرد؟: کارەکەی لەسەر عەمر جێبەجێ کردووە کە بەوەش عمر بۆتە مفعول بە.

[أَخَذَ مُحَمَّدٌ الْمَالَ]
محمد مالەکەی وەرگرت،
ئەمەش وەک ئەوی تر. کە محمد مالەکەی وەرگرتووەو کە مالەکە کار لەسەر کراوە و ڕووداوەکەی لەسەر ڕوداوە،
مانای الوُقُوعِ(ڕوودانەکە)چییە؟: واتا بەدەست هێنان، کە ئەمەش واتا چیان بۆ جێبەجێ بووە؟ الأخذ (وەرگرتن)والأكرام(ڕێزلێنان)ـی بۆ جێبەجێ بووە، واتا کە باسی المال دەکەین چی بۆ بەرجەستە بووە اخذ (وەرگرتنی)بۆ بەرجەستە بووە، یان عمر چی بۆ بەرجەستە بووە؟ ڕێزلێنان، واتا کە دەڵێین فعل ـەکە لەسەری ڕوویداوە واتا لەسەری جێبەجێ بووە.
مح

②-
الْمَفْعُولُ الْمُطْلَقُ: چاوگە، ئەو چاگەی کە دەبێتە منصوب،

بۆ سی شتیشە

1-

بۆ لِتَأْكِيدِ مَعْنَى الفِعْلِ(دڵنیاکردنەوەی واتای کارەکەی)مانای فعلەکەیە(واتا بۆ دڵنیاکردنەوەی ئەوەی (کە کارەکە ڕوویداوە تۆش جەختی لێدەکەیەوە بەو مفعولە کە کارەکە ڕوویداوە)

وەکو [ضِرَبْتُهُ ضَرْباً]

(لێیمدا بە لێدان)

(ضِرَبْتُهُ)ئەو هُ: مفعول بە یە

وە تُ: فاعلە

وە ضرب: فعلەکەیە

وە ضرباً: ئائەمە مفعول مطلق ـە لِتَأْكِيدِ مَعْنَى الفِعْلِ بۆ ڕوونکردەوەی واتای کارەکە یان دڵنیا کردنەوەی کارەکە کە ڕوویداوە.

ئیعرابەکان:

(١) أَكْرَمَ: فِعْلٌ مَاضٍ. زَيْدٌ: فَاعِلٌ. عَمْرًوا: مَفْعُولٌ بِهِ.

(٢) أَخَذَ: فِعْلٌ مَاضٍ. مُحَمَّدٌ: فَاعِلٌ. المَالَ: مَفْعُولٌ بِهِ.

(٣) وَقَدْ يَكُونُ غَيْرَ مَصْدَرٍ.

(٤) ضَرَب: فِعْلٌ مَاضٍ مَبْنِيٌّ عَلَى السُّكُونِ لِاتِّصَالِهِ بِضَمِيرِ رَفْعٍ (تُ). التَّاءُ: فِي مَحَلِّ رَفْعٍ فَاعِلٌ. الهَاءُ: ضَمِيرٌ مُتَّصِلٌ فِي مَحَلِّ نَصْبٍ مَفعُولٌ بِهِ. ضَرْبًا: مَفْعُولٌ مُطْلَقٌ لِتَأْكِيدِ الفِعْلِ وَهُوَ مَنْصُوبٌ.

2-

وەهەنێک جار لِبَيَانِ عَدَدِ الفِعْلِ[بۆت ڕوون دەکاتەوە کە کارەکە چەند جار ڕویداوە]

وەکو[ضَرَبْتُهُ ضَرْبَةً (یەک دانەم لێیدا) أَوْ ضَرْبَتَيْنِ(یان دوو دانەم لێیدا)]

کەواتە دەڵێین: ضَرْبَةً یان ضَرْبَتَيْنِ دەڵێین مفعول

مطلقە لِبَيَانِ عَدَدِ الفِعلِ(بۆ ڕوونکردنەوەی ژمارەی کارەکە یان ڕوودانەکەی کە چەند جار ئەو کارە ڕویداوە)

3-
یاخود بۆ لِتَأْكِيدِ نَوعِ الفِعْلِ(ڕوونکردنەوەی ڕوودانی جۆری فعلەکە{یانی بۆت ڕوون دەکاتەوە کە کارەکە چۆن ڕوویداوە(کە دەڵێ دانیشتم ئایە چۆن دانیشت بەدانیشتنێکی چۆن یان دەڵێ بەدانیشتنی فلان ئاوا.})

جَلَسْتُ جَلْسَةً
( دانیشتم بە دانیشتنێک)

یاخود نمونەی تر جَلَسْتُ جُلُوساً(دانیشتم بە دانیشتن) کەواتە لێرە فعلی جلس ـەکە دڵنیا دەکاتەوە لێرە بۆ لِتَأْكِيدِ مَعْنَى الفِعْلِ

جَلَسْتُ جَلْسَتَينِ(دوو دانیشتن دانیشتووم)
ئەوە بۆ لِبَيَانِ عَدَدِ الفِعْلِ

جَلَسْتُ جِلْسَةَ الأَمِيرِ(دانیشتم بە دانیشتنی أمیر)واتا وەک امیر دانیشتم
ئەوەیان بۆ، لِتَأْكِيدِ نَوعِ الفِعْلِ.

وەیان هەر بۆ ڕوونتر بوون:

〖 مفعول مطلق: بریتیە لە مەسدەرێک وە دەبێ مەنسوب بێت وعلامەتی نسبەکەی یان فتحەیە یان یاء، وە دەکەوێتە کۆتاییەوە کە لەپێشیەوە فعلێک دێت ئەو مەسدەرە لەو فعلەوە وەرگیراوا(فعلەکە مازی بێ مزارع یا ئەمر)

جۆرەکان و گوزارشتەکانی مغعول مطلق

1-
لە توکید: ضربتُ زیدًا ضربًا، لەزەیدم دا بەلێدان

2-
لبیان نوع الفعل: ضربتُ زیدًا ضربًا شدیدًا، تا ضربًا لتوکیدە بەڵام دواتر شدیدًا جۆری لێدانەکەی دەستنیشان کردووە کە بەهێز بووە دەبێتە لبیان نوع الفعل.وە بۆ جیاکردنەوە لە تەوکید دوو شت بزانە یەکەم ئەگەر مفعول متڵقەکە واتا (چاوگەکە لێرە ضربًا) لەدوایەوە وشەیەک هاتبوو وەک ئەو بوو وەک واتا ئاوا زرعتُ الأرضَ زرعًا، زەویەکەم کێڵا بەکێڵان، تائێرە لتوکیدە بەڵام کە لەدوا مفعول متڵەقەکە(زرعا) وشەیەکی تر هات هەمان حرکەی وی وەرگرتبوو ئەوا دڵنیابە لتوکید نییە ئاوا، زرعتُ الأرضَ زرعًا جمیلًا، زەویەکەم کێڵا بەکێڵانێکی جوان، کەواتە لبیان نوع فعلە، وەدووەم شتێکی تر ئەگەر بینیت مفعول متڵق تنیونی فتحەی نەبوو بەڵکو بەس فتحەی وەرگرتبوو واتا ببێتە مزاف ئەوا سەتا سەت بزانە توکید نیەو نوع فعلە، مرَّ الغزالُ مُرُورَ البرقِ، ئاسکەکە تێپەڕی وەک تێپەڕینی تریشقە، لێرە مرور مزافە البرق مزاف الیە ـیە، کە ،مفعول متڵق بەس فەتحەی وەرگرتووە

3-
لبيان عدد الفعل(وەتا ژمارەی ڕوودانی کارەکەمان بۆ دیاری دەکات: نموونە سجدتُ سَجدَتَينَ، کڕنووشم برد دوو کڕنووش، یان ضربتُ الكرةَ ضربتين، لە تۆپەکەم دا دووجار

ضربتُ الكرةَ ثلاث ضربات، سێجار لەتۆپەکەم دا.

تێبینی: لەجۆری التوكيد بەردەوام تەنوین فەتحە وەردەگرێت بەڵام لەدوو جۆرەکەی تر تنوين فتحەو {ضَرْبًا}، وە تەنها فەتحەیەکیش وەردەگرێت {ضَرْبَ}بەکورتی لە توكيد تەنها بە تەنوینە بەڵام لە دوەکەی تر هەردووک جۆرە تەنوین و بێ تەنوین.〗

③-
الْمَفْعُولُ فِيْهِ (ئەم مفعولە زەرفی زەمانو مەکانە واتا پێت دەڵێت کە کارەکە لەکوێدا ڕویداوە واتا کارەکە تیایدا ڕوویداوە، جا فعل یان لە زەماندا ){کاتدا}ڕوودەدات یان لە مەکاندا(شوێن) یانی ڕوونی دەکاتەوە کارەکە لەکوێدا ڕوویداوە یان لە چ کاتێکدا: ئەوەیە کە فعل و فاعل تیایدا{ ڕوویداوە، مەبەستمان پێی ظرفي زەمانو مەکانە،}

وەکو أَتَيْتُ الْمَسْجِدَ اللَّيْلَةَ{هاتم بۆ مزگەوتەکە ئەمشەو}

کەواتە اللَّيْلَةَ: مفعول فيه ـيەو ظرفي مەکانە

جَلَسْتُ أَمَامَ الْبَيْتِ(دانیشتم لەلای ڕاستی خانوەکە)

جلس فعلەو تُ فاعلەو امام ظرفي مكانه شوێنە وە دەشڵێی منصوب على ظرفية

وە امام دەبێتە مضاف و بيت دەبێتە مضاف اليه.
ئەو ظرفەی کە بۆ زەمانە هەموویان مەنصوبن.

بەڵام ئەوەی بۆ مەکانە دوو جۆرە:

1-
ئەوەیە جە بۆ شوێنێکی نادیار بێت، مەبەستمان پێی هەر شەش ئاڕاستەکەیە[وە ئەمە بەردەوام مەنصوبە]
{أَمَامَ، خَلْفَ،، فَوْقَ، تَحْتَ، يَمِيْنَ، شَمَالَ} کە دەڵێی لەسەرووتەوە تا ئاسمان هەر سەرەوەیە، یان لەپێشتەوە تا بڕوا ڕێگە هەیەو سنورێکی نییە،

2-
ئەوەیە کە سنورێکی دیاری کراوی هەیە وەک{اَلْدَّارِ، الْمَسْجِدِ}کە دەڵێی ماڵ ئەو شتەیە کە چوار دیواری سەقفێکی هەیە سنورێکی دیاری کراوی هەیە وە دەرەوەی ماڵەکە جادە یان شوێنی تر داخلی قسەکەت نابێت وە سنورێکیان هەیە.[بەڵام ئەمانە مجرورن وە پێویستیان بە حرف جەرەکانە، واتا ئەوانەی کە شوێنێکی دیاری کراون پێویستیان بە حرفێکی جرە، بەبێ حرف جر ئیشەکە ناڕوا وەکە حرف جر لەپێشیەوە هات مجرور دەبێت.
تێبینی: ئەوەی کە ظرف مکان ـە دەبێت هەمیشە فی لەگەڵا هاتبێت(یاخود حرف جر)وەکو[جَلَسْتُ فِي الْدَّارِ]{دانیشتم لە ناو ماڵەکە}، وە ناکرێت في تیا بسڕیتەوە وەکو [جَلَسْتُ الْدَّارَ] ئەمە مانایەکی درووستی نییە دەبێت (لە)لەگەڵا بێت في(خۆی في واتا لەناو بەس هەنێ جار بە واتای لە ـش دێت.)

④-
الْمَفْعُولُ مَعُهُ(ئەوەیە کە تۆ ڕوونی دەکەیەوە کە کردارەکە لەگەڵ ئەو ڕوویداوە، واتا کردارەکەی لەگەڵئەودایە بەشداری پێکردنی تیایە چۆن:) ئەوەیە کە لەدوای {و} [واتا ئەو مەفعولە لەدوای واوێکەوەیە{و} کە بەو {و}دەڵێن واوی مَعَ{لەگەڵ}.

وەکو
[ذَهَبَ مُحَمَّدٌ وَالْجَمَاعَةَ]
محمد لەگەڵ کۆمەڵەکە ڕۆیشت
ئەو (و) واوی مَعَ ـەیە واتا مع الجماعة

ذهب: کارە

محمد: بکەرە
و: واوی مع، وە مبنیە لەسەر فەتحە
واتا الجماعة: الْمَفْعُولُ مَعُهُ ـوە منصوب علمات نصبه الفتحة

ئیعرابەکان:

-------------------------

(١) أَتَيتُ: فِعْلٌ وَفَاعِلٌ. الـمَسْجِدَ: مَفْعُولٌ بِهِ. اللَّيْلَةَ: مَفْعُولٌ فِيْهِ (ظَرْفُ زَمَانٍ) مَنْصُوبٌ عَلَى الظَّرفِيَّةِ.

(٢) ذَهَبَ: فِعْلٌ مَاضٍ. مُحمَّدٌ: فَاعِلٌ. الوَاوُ: للمَعِيَّةِ. الجَماَعَةَ: مَفْعُولٌ مَعَهُ مَنْصُوبٌ.

⑤-

الْمَفْعُولُ لَهُ(مەفعوله لەبەر ئەوە}، یان، { الْمَفْعُولُ لِأَجَلِهِ( لاجله واتا لەبەر ئەو یان لەبەرخاتری ئاو)}] ئەمەیان پێت دەڵێت کە کردارەکەت بۆچی ڕوویداوە هۆکارەکەی چییە]: بریتییە لەو هۆکارەی کە کارەکەی بەهۆی ئەوەوە ڕوویداوە یان کراوە,

وەکوضَرَبْتُهُ تَأْدِيباً]{لێیمدا بۆ ئەوەی فێرە ئەدەب بێت}

ضرب: کارەکەیەو

تُ: بکەرەکەیە کە بۆخۆم دەگەڕێتەوە

هُ: مفول بە یە کە کارەکە لەسەر ئەو جێبەجێ کراوە

وە الْتَأْدِيبُ{تەربێتدان}هۆ کارە بۆ فعلی الْضَّرْبِ{لێدان} ، چوونکە لەبەر ئەدەب لێتداوە کەواتە دەڵێین مفعول لە ـوە

وە الناظم ئەو مفعولانەی لە بەیتە شعرێک کۆکردۆتەوە(هەر پێنج جۆری مفعولەکەی تیایە)

وَقَدْ جَمَعَ النَّاظِمُ هذِهِ الـمَفْعُولَاتِ بِبَيْتٍ مُفْرَدٍ وَهُوَ:

[مِنَ البَسِيْطِ]

ضَرَبْتُ ضَرْبًا أَبَا عَمْرٍو غَدَاةَ أَتَى وَسِرْتُ وَالنِّيْلَ خَوْفًا مِنْ عِتَابِكَ لِي[٢]

وە ئەسڵ لە مەنصوبەکان ئەو پێنج مەفعولەیە.

## وانەی نۆیەم

المنصوبات الفرعية

ئیعرابی شعرەکەی سەرێ:

له ابا عمرم دا بەلێدان بەرەبەیان هات، وە ڕۆیشتم لەگەڵ نیلدا لەترسی سەرزەنشتی تۆ

ضرباً: دڵنیای لێدانەکە دەکاتەوە کەواتە، مفعول مطلق

ابا عمر: کارەکەی لەسەر کراوە کەواتە، مفعول به

غداة: کاتی تیایە کەواتە مفعول فيه

والنيل: واتا مع النيل کەواتە مفعول معه

خوفا: مفعول لاجله یە، یانی ئەو بۆچی ڕۆیشتووە؟ لەترسی سەرزەنشتی ئەو.

---

المنصوبات الفرعية:

ئەسڵ له المنصوبات ئەو پێنج مفعولەیە کە ڕۆیشتن، وە کۆمەڵێک پاشکۆ هەن کە دەلکێن بەو پێنج مەفعولەوە

①-

الْمُنَادَى: لێرە مەبەستمان بانگ کردنی المُضَافَ وَالْشَّبِيْهِ بَالْمُضَافِ[لێرە مەبەستمان بەس لەو دووەیە چوونکە هەنێک منادی مەبنییە، بەڵام منادای مضاف شبیه مضاف هەردووک مەنصوبن]

وەکو: [يَا عَبْدَ اللهِ أَقْبِلْ. (ئەی بەندەی الله وەرە پێش) ]

هەرشتێک لەو منادایە دانەپاڵی تیابوو ئەوا مناداکە مەنصوبە وە عبد لێرە منادایەکەیەچوونکە یا کە چۆتە سەری کە یا ئەکە حەرفی بانگکردنە، وە ئەم جۆری منادایە کە منادایە مضاف ـە هەمیشە مەنسوبە(مەبەست پێی مضاف و مضاف اليه)[واتا (یا)چۆتە سەر مضاف و مضاف اليه]

عبد: منادایەو مەنصوبە وعلاماتە فتحە وە مضافە

وە الله: اسم جلالة یە وە مضاف اليه یەو مجرورە

وَالْشَّبِيْهِ بَالْمُضَافِ

و[يَا خَيْرًا مِنْ زَيْدٍ]

خيرًا: لێرە پێی دەوترێت الْشَّبِيْهِ بَالْمُضَافِ

،منادای الْشَّبِيْهِ بَالْمُضَافِ چییە؟: ئەو منادایەیە کە شتێکی هەیە تەواوی دەکات وە لێشی دانابڕێت

وە سێ جۆریشی هەیە

1-

،یان تەواوکەرەکە مفعول بە یە : [يَا كَاتِباً الْقِصَّةَ](ئەی ئەو کەسەی کە چیرۆکەکە دەنووسی)(یان ئەی نووسەری چیرۆکەکە)

یا کاتبا، ئەی نوسەر، ئێ نوسەری چی؟

القطة: لێرە ئەمە واتاکەی تەواو دەکات القطة یە کە مفعول بە یە، کە بەبێ ئەوە ماناکەی تەواو نابێت

2-

یاخود فاعلە: [يَا حَسَناً خُلُقُهُ] لێرە کە دەڵێی یا حسنا ئەی ئەو کەسەی کە جوانە چی جوانە خلقە کەلێرە منادای شبە مضاف تەواو کەرێکی هەیە کە فاعلە، واتا شتێک واتاکەی تەواو دەکات.

3-

یاخود جار و مجرور: [يَا خَيْرًا مِنْ زَيْدٍ]{ئەی چاکتر لە زەید}

کە دەبینین یا خیرا لێرە(ئەو ئەو کەسەی باشتری واتاکەی ڕوون نییە)بەڵام دواتر جارو مجرور واتاکەی تەواو دەکەن کە من حرف جەرەکەیەو زید کە اسم مجرورەکەیە.

وە بەشتێکی تریش دەیناسیتەوە، الْشَّبِيْهِ بَالْمُضَافِ هەمیشە تنوینی هەیە(دوو دانە فەتحە ً ) بەڵام الْمُضَافَ وانییە نموونە(یا عبدَ اللهِ) کە عبدَ تنوین نییە یەک فەتحەیە.

بەڵام هەردووکیان مەنسوبن منادای  المُضَافَ وَالْشَّبِيْهِ بَالْمُضَافِ.

ئەی باشە ئەمانە مەنسوبن ئەی چیترمان هەیە مەنسوب نەبێت)

1-
هەرچی منادی ـای مفردی معرفة، (ناسراو بێت) [وەک محمد احمد یان هەرناوێک بانگیەکەی یان دەوڵەتێک[هەمووی مەبنییە لەسەر ضمة, وەکو [ یَا مُحَمَّدُ ]ضمة وەردەگرێ بەڵام بە تەنوین نا مەبنیە لەسەر ضمة، یانی بەس ضمة وەرەگرێت بێ تنوین.

ئیعرابەکان:

(١) أَلْحَقُوا الـمُنَادَى بـ(الـمَفْعُولِ بِهِ)، عَلَى أَنَّ نَصْبَهُ بِتَقْدِيرِ فِعْلٍ، كَقَوْلِكَ فِي (يَا عَبْدَ اللهِ)، أَيْ: (أَدْعُو عَبْدَ اللهِ)، أَوْ: (أُنَادِي عبْدَ اللهِ).

(٢) الشَّبِيْهُ بالـمُضَافِ هُوَ الـمُنَادَى الَّذِي لَهُ مُكَمِّلٌ يُكَمِّلُهُ وَلاَ يُفَارِقُهُ، وَهُوَ ثَلَاثَةُ أنواعٍ، فَالـمُكَمِّلُ إِمَّا مَفْعُولٌ بِهِ، نَحْوُ: (يَا كَاتِبًا القِصَّةَ)، أَوْ فَاعِلٌ، نَحْوُ: (يَا حَسَنًا خُلُقُهُ)، أَوْ جَارٌّ وَمَجْرُورٌ، نَحْوُ: (يَا خَيْرًا مِنْ زَيْدٍ)، وَالشَّبِيهُ بِالـمُضَافِ مُنَوَّنٌ دَائِمًا وَالـمُضَافُ لَيسَ كَذلِكَ.

(٣) يَا: حرْفُ نِدَاءٍ مَبْنِيٌّ عَلَى السُّكُونِ. عَبْدَ: مُنَادَى مَنْصُوبٌ وَهوَ مُضَافٌ. اللهِ: اسْمُ الجَلَالَةِ مُضَافٌ إِلَيْهِ مَجرُورٌ. أَقْبِلْ: فِعْلُ أَمْرٍ مَبْنِيٌّ عَلَى السُّكُونِ، وَفَاعِلُهُ ضَمِيرٌ مُسْتَتِرٌ وُجوبًا تَقدِيرُهُ: (أَنتَ).

(٤) يَا: حرْفُ نِدَاءٍ مَبْنِيٌّ عَلَى السُّكُونِ. خَيْرًا: مُنَادَى مَنْصُوبٌ وَهوَ شَبِيهٌ بالـمُضَافِ. مِنْ: حَرْفُ جَرٍّ مَبْنِيٌّ عَلَى السُّكُونِ. زَيْدٍ: اسْمٌ مَجْرُورٌ.

(٥) يَا: حرْفُ نِدَاءٍ مَبْنِيٌّ عَلَى السُّكُونِ. مُحَمَّدُ: مُنَادَى مَبْنِيٌّ عَلَى الضَّمَّةِ فِي مَحَلِّ نَصْبٍ

2-
وەهەروەها الْنَّكِرَةُ الْمَقْصُودَةُ ئەوەش مەبنییە لەسەر ضمة {الْنَّكِرَةُ الْمَقْصُودَةُ ـمان هەیە و الْنَّكِرَةُ غَيرُ الْمَقْصُودَةُ شمان هەیە هەردووکیان لە بنەڕەتدا نەکیرەن یان ئەگەر سەیر بکەی هەردووکیان رجل ـمان هەیە}چوونکە رجل نکرەیە نازانی کام پیاوە چوونکە هەموو پیاوێک دەگرێتەوە بەڵام نەکیرەی مەقسودە لەو هەموو پیاوە مەبەستت دانەیەکە(واتا لەناو ئەو هەموو پیاوە مەبەستت یەک پیاوە)وەکوو: [يَا رَجُلُ]{ئەی پیاوەکە}

مەبەستمان لە نەکیرەی مەقسودە ئەوەیە کە تۆ بانگ دەکەیت مەبەستت یەک دانەیە بەدیاری
کراوی وەبەڵام کەسێکی ناسراو نییە،
وەکو لەڕێگا دەیگەی بە کەسێک بانگی دەکەیت [يَا رَجُلُ]ئەی پیاوەکە، بەڵام ناشی ناسیت، کەواتە
ئەو نەکیرەیەش نەکیرەی مەقسودە مەبنییە لەسەر ضمة وەکو مفر المعرفة.

3-
وەبەڵام الْنَّكِرَةُ غَيرُ الْمَقْصُودَةُ ئەوە مەنسوبە{کەواتە ئەمەیان دەلکێنرێت بە }المُضَافَ وَالْشَّبِيْهِ
بَالْمُضَافِ، وەلەم بانگ کردنەدا مەبەستت لە کەسێک نییە بەدیاری کراوی، وەک قسەی کەسێکی
کوێر
[يَا رَجُلاً خُذْ بِيَدِي]
(ئەی پیاوەکە{یاخود ئەی پیاوێک} دەستم بگرە) {یاخود ئەی پیاوێک دەستم بگرێ}{یاخود، ئەی
پیاوێک بەدەستم بمگرێت)

لێرە مەبەستی هەر پیاوێکە کە دەستی بگرێ ، وەواتا مەبەستی کەسێکی دیاری کراو نییە، وەبەڵام
لە نەکیرەی مەقسودەکە مەبەستی یەک دانە بوو بە دیاری کراوی بەڵام نایناسێت، وە لەمە
نەدەیناسێت نە مەبەستی یەکێکی دیاری کراوە، کەواتە ئەمەیان مەبەستی هەموو پیاوەکانە وە
کەسێک دیاری ناکات،

یاخود وەک وتەی وتاربێژ،
[ يَا مُفَرِّطاً]
ئەی کەمتەرخەمێک(واتا ئەو کەسەی کە کەمتەرخەمی کردووەو شلگیرە)(, ئا ئەمە مەبەستی
تاکە کەسێک نییە، بەڵکو مەبەستی هەموو ئەو کەسانەیە کە کەمتەرخەمیان کردووەو ئەمە
پیشەیانە، واتا کەسە کەمتەرخەمەکە مەبەستی پێی تاکە کەسێک نییە مەبەستی هەموو ئەم
کەسانەیە کە کەمتەرخەمیان کردووە.

کەوتاتە ئەمانەمان بۆ دەرکەوت:
المضاف، والشبيه بالمضاف، والنكرة غير المقصود: منصوبٌ.

المفرد المعرفة، والنكرة المقصود: مبني على الضَمَّةِ.

تێبینی: هەنێک جار پیتی بانگکردن دەسڕدرێتەوە لە بانگکردنی الْعَلَمِ{نیشانکراو) لەگەڵ الْمُضَافِ،

وەکو: { يُوسُفُ أَعۡرِضۡ عَنۡ هَٰذَاۚ} [سورەتی یوسف: ٢٩]
کە پیتی بانگکردنەکە سڕاوەتەوە، واتا خۆی یا یوسف ـە

{فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ}[سورەتی الزمر: ٤٦]
لێرەش ئەینەن شت واتا یا فاطر
پیتی بانگکردنەکە سڕاوەتەوە.(لە بەشی النداء باسی پیتی بانگکردنەکان دەکەین إن شاء الله.)

هەندێک جار المنادی تەرخیم دەکرێت واتا مەبەستمان لەوەیە، سڕینەوەی کۆتاییەکەی لەبەر ئاسانکاری

---

خۆی فاطمة ـیە بە ة دەبینین ة فاطم ـەکەی سڕیوەتەوە بۆتە مُنَادًى مُرَخَّمٌ(واتا تەرخیم کراوە کۆتاییەکەی سڕاوەتەوە,) بەدوو شێواز ئیعراب دەکرێت(دوو لغة تیایە)

1-
لُغَةُ مَنْ يَنْتَظِرُ الْحَرْفَ الأَخِيرَ(واتا تۆ درووستە بڵێیت أفاطمُ یان أفاطمَ، کاتێک کە ة ـئەکە دەسڕیتەوە، درووستە بڵێین أفاطمُ یان أفاطمَ هەردووک درووستە}[ لُغَةُ مَنْ يَنْتَظِرُ الْحَرْفَ الأَخِيرَ واتا زمانی ئەو کەسەی چاوەڕێی پیتی کۆتایی دەکات، واتا وەک ئەوەی پیتی کۆتایی نەسڕیبێتەوە هێشتا چاوەڕوانی بکات تا بیڵێت:] واتا وەک ئەوەی ئەو کەسەی کە قسەکە دەکات نەیەوێت ئەو ة ـئە بسڕێتەوە واتا بڵێت أفاطمَةُ، واتا وەک ئەوەی کە چاوەڕوان بێت ئەو ةـ بڵێت(ئەوکاتە جووڵەی مَ ـەکە چۆنە ئەوە دەڵێتەوە چوونکە خۆی فەتحەی هەیە) جابۆیە جوڵەی مَ ـەکە دیڵێتەوە وەک خۆی وە دەڵێت(أفاطمَ)وە لەنموونەی تر(يَا مَالِك) دەبێتە:[ يَا مَالِ] لێرە مالک لِ ـەکە کەسرەی هەیە وەک خۆی مایەاە، وە نموونەی تر (يَا مَنْصُور)دەبێتە: [يَا مَنْصُ] لێرەش ئەینەن شت[واتە هەر جووڵەیەکیان هەبوو دوای سڕینەوەی پیتی کۆتایی ئەوە دادەنێیتەوە]، کەواتە بەهێشتنەوەی جووڵەی کۆتایی دوای سڕینەوەی وەک ئەوەی هەیە.

2-
لُغَةُ مَنْ لَا يَنْتَظِرُ الْحَرْفَ الأَخِيرَ[زمانی ئەو کەسەی چاوەڕوانی پیتی کۆتایی ناکات:] چاوەڕوانی پیتی کۆتایی ناکات[واتا أفاطمَةُ لەدوای ئەوە ة ئەکەی سڕیەوە م ـەکە کە ماوەتەوە مەبنی دەکات لەسەر ضمة ئاوا أفاطمُ] وەک ئەوەی کە وشەکە هیچ سڕینەوەیەک تیایدا ڕوویندابێت وەک خۆی مابێتەوە، بۆیە مەبنی دەکا لەسەر ضەمە

کەواتە دوو لغە مان هەیە لە منادای مرخم (مرخم چییە؟ واتا پیتی کۆتایی دەسڕینەوە)دوای

شتەکە(مەبەست کذا ـیە) نادیارە واتا بڕەکەی نازانیت یانی وەک ئەوە نییە بەدیاری کراوی بڵێیت
،چەندە بۆنموونە دەیە پێنجە چوارە} وە ئەوانیش ()، وەکو (کم درهما مالک، ماڵەکەت چەندە
لەڕاستیدا کم بە تەفسیری ناچێتە ژێر بەشی کنایات بەڵام ئیتر کردۆتیانێ لەبەر ئەوەی لە کذا]
.نزیکە]،) یان دەڵێیت،، کان من الامر کیت وکیت

تَنْبِيْهٌ: قَالَ الحَرِيرِيُّ فِي (دُرَّةِ الغَوَّاصِ): الْعَرَبُ تَقُولُ: (كَانَ مِنَ الْأَمْرِ كَيْتَ وَكَيْتَ)، وَ(قَالَ فُلَانٌ ذَيْتَ وَذَيْتَ)، فَيَجْعَلُونَ (**كَيْتَ وَكَيْتَ**) كِنَايَةً عَنِ الْأَفْعَالِ، وَ(**ذَيْتَ وَذَيْتَ**) كِنَايَةً عَنِ الْمَقَالِ، كَمَا أَنَّهُمْ يَكْنُونَ عَنْ مِقْدَارِ الشَّيْءِ وَعِدَتِهِ بِلَفْظَةِ (**كَذَا وَكَذَا**) فَيَقُولُونَ: (قَالَ فلَانٌ مِنَ الشِّعْرِ كَذَا وَكَذَا بَيْتًا)، وَ(اشْتَرَى الْأَمِيرُ كَذَا وَكَذَا عَبْدًا).

تێبینی: کاتێک عەرەب کیت وکیت بەکار دێنێت بۆ فعلی بەکار دێنێت یانی کاتێک باسی فعلێک
دەکەیت (دەڵێیت کارەکە ئاواو ئاوا بوو،) بەڵام بۆ وتە کاتێک دەڵێیت ئەوەو ئەوەی وت دەڵێێت ذیت
وذیت، وەهەروەها بۆ ئەندازەو بۆ بڕ کذا وکذا بەکار دێت کە واتا ئەوەندەو ئەوەندە،{ قال فلان من
الشعر کذا وکذا بیتا، کەسێک وتی لە شعرەکە ئەوەندەو ئەوەندە بەیتە، بەیتە شعر ژمارەیە}یان
{.اشترى الأمير كذا وكذا عبدًا، ئەمیرەکە ئەوەندەو ئەوەندە کۆیلەیەی کڕی}

وَ(**كَمْ**) تَأْتِي عَلَى نَوْعَيْنِ: اسْتِفْهَامِيَّةٍ وَخَبَرِيَّةٍ، فَعَلَى الْأَوَّلِ تَنْصِبُ مَا بَعْدَهَا، نَحْوُ: (كَمْ رَجُلًا عِنْدَكَ؟)، وَعَلَى الثَّانِي تَجُرُّهُ، نَحْوُ: (كَمْ رَجُلٍ كَرِيمٍ عِنْدِي)، يَعْنِي: عِنْدِي كَثِيرُونَ.

کم: لەسەر دوو بەش دێت: یان پرسیاریە(بۆ پرسیار کردنە) یان هەواڵی(یانی هەواڵێکی پێ
دەدەیت لەوکاتەی کە هەواڵەکەش دەدەیت ڕوونی دەکەیتەوە کە ئەو شتە زۆر بووە یانی کم خبری
بۆ التَّكثِيرُ(زۆرکردن) یش ـەکار دێت) وە لەوەی یەکەم یانی کاتێک پرسیاریە دوای خۆی
مەنسوب دەکات{ کم رجلا عندک، چەند پیاوت لایە، ئەو کم، کم ـی الاستفهامیە مبنیە لەسەر
سکون،} وە لەوەی دووەم واتا هەواڵی دوای خۆی مەجرور دەکات {کم رجل کریم عندی،} واتا
،زۆرم لایە ، واتا زۆر پیاوم لایە. یانی کاتێک بە مجروری دێت هەواڵ دەدەی کە زۆری لایە
بەڵام بە مەنسوبی پرسیار دەکەیت چەنێکی لایە، وە لە پرسیاریەکە کە وتمان دوای

خۆی مەنسوب دەکات رجلا دەبێتە التمییز.
ئیعرابەکان:

(١) إِعْرَابُ هذِهِ الأَسْماءِ يَكُونُ حَسَبَ مَوَاقِعِهَا فِي الجُمْلَةِ.

(٢) كَمْ: اسْمُ اسْتِفْهَامٍ مَبْنِيٌّ عَلَى السُّكُونِ فِي مَحَلِّ رَفْعٍ مُبْتَدَأٌ. دِرْهَماً: تَمْيِيزٌ مَنْصُوبٌ بِالفَتْحَةِ الظَّاهِرَةِ. مَالُ: خَبَرٌ مَرْفُوعٌ وهُوَ مُضَافٌ، وَالكَافُ فِي مَحَلِّ جَرٍّ مُضَافٌ إِلَيْهِ.

(٣) عِنْدِي: شِبْهُ جُمْلَةٍ فِي مَحَلِّ رَفْعٍ خَبَـرٌ مُقَدَّمٌ. كَذَا: كِنَايَةٌ عَنْ عَدَدٍ مُبْهَمٍ مَبْنِيٌّ عَلَى السُّكُونِ فِي مَحَلِّ رَفْعٍ مُبْتَدَأٌ مُؤَخَّرٌ. دِرْهَمًا: تَمْيِيزٌ مُحَوَّلٌ عَنِ الـمُبْتَدَإِ مَنْصُوبٌ.

(٤) كَانَ: فِعْلٌ مَاضٍ نَاقِصٌ. مِنَ الأَمْرِ: جَارٌّ وَمَجرُورٌ فِي مَحَلِّ نَصْبٍ خَبَـرُ (كَانَ). كَيْتَ وَكَيْتَ: كِنَايَةٌ عَنِ العَدَدِ مَبْنِيٌّ عَلَى فَتْحِ الجُزْئَيْنِ فِي مَحَلِ رَفعٍ اسْمُ (كَانَ).

إِعــرَاب (كَم):

لِـمَعْرِفَةِ مَوْقِعِهَا الإِعْرَابِيِّ نَنْظُرُ إِلَى مَا بَعْدَ تَمْيِيزِهَا:

**أَوَّلًا:** تُعْرَبُ **فِي مَحَلِّ رَفْعٍ مُبْتَدَأً** إِذَا كَانَ مَا بَعْدَ التَّمْيِيزِ:

١- فِعْلًا لَازِمًا، نَحْوُ: (كَمْ رَجُلًا جَاءَ؟)، أَوْ فِعْلًا مُتَعَدِّيًا اسْتَوْفَى مَفْعولَهُ، نَحْوُ: (كَمْ رَجُلًا زَارَكَ؟)، أَوْ ظَرْفًا، نَحْوُ: (كَمْ كِتَابًا عِنْدَكَ؟)، أَوْ: جَارًّا وَمَجْرُورًا، نَحْوُ: (كَمْ رَجُلًا فِي الدَّارِ؟).

تُعْرَبُ فِي مَحَلِّ رَفْعٍ خَبَرًا إِذَا جَاءَ بَعْدَهَا اسْمٌ مَعْرِفَةٌ، نَحْوُ: (كَمْ مَالُكَ؟).

وە ئەی ئیعرابی کم چۆندەکرێت: بۆئەوەی بزانین کم چۆن ئیعراب دەکرێت دەڕوانین بۆ ئەوەی لەدوای تەمیزەکەیەتی مەبەستمان ئەوەیە دەڵێین کم رجلا ئەوەی دوای رجلا ـکە چییە ئەوەمان پێویستە سەیری دەکەین دواتر دەتوانین بزانین ئیعرابی کم چییە، چوونکە کم کاتێک دەڵێین مبنیە لەسەر سکون محل اعراب ـی هەیە یانی ئیعرابێک دەکرێت.

1-
یان ئەوەیە ئەوەی کە لەدوای تەمیزەکەیە فعلێکی لازمە فعلی لازم وتمان ئەوەیە کە مفعول بە نییە، وەکوو {کم رجلا جاء، چەند پیاو هاتووە}، یان فعلێکە موتەعەدیە مفعولەکەشی هاتووە وەکو{کم رجلا زارک، چەند پیاو سەردانیان کردی}،[[چۆن فعلی لازم و موتەعەدی لێک جیابکەینەوە،
فعلی لازم ئەوەیە کە بەخودی خۆی ماناکە تەواوەبێت تەنها پێویستی بە

،فاعلێکە، بەڵام فعلی موتەعدی بەبێ مفعول بە ماناکەی تەواو نابێت((بۆ نموونە دەڵێیت جاءَ محمدٌ محمد هات، کە هیچ کێشەیەکی نییەو واتاکەی تەواوەو پێویستت بەهیچی تر نییە ڕوونی بکاتەوە چاوەڕێی قسەیەکی تر نیت تا ڕستەکە ڕوون بێتەوە، بەڵام نموونەیەکی تر کە فعلێک تەنها بە فعلو فاعل ئیشەکە نەڕوا ڕوون نەبێت أكرمَ خالدٌ، لێرە دەڵێیت خالید ڕێزی نا، یانی تەنها بەوەنە ئیشەکە ناڕواو زۆر ڕوون نییە هەتا نەزانین کە ڕێزی لەکێ ناوە نموونە أكرمَ خالدٌ بكرًا(خالید ڕێزی لە بەکر نا)، کەواتە بەبێ مفعول بە واتاکەی تەواو نییەو نابێت و ڕوون نییە، کە دەڵێیت خالید ڕێزی نا ڕێزی لەکێ نا یانی تا مفعول بە باس نەکەیت واتاکەی ڕاست  تەواو نابێت، بەڵام لە لازم وانییە محمد هات تەواو ڕوونەو تەواوە یان طَابَ زيدٌ، زەید پاکو چاک بوو، یان حَسُنَ زيدٌ، زەید جوان بوو لێرە هیچ کێشت نییە تەنها فعو فاعلت بەسە بەڵام لە موعتەدی وا نییە، بۆ نموونە دەڵێیت أَعْطَى محمدٌ، محمد دای بە، کە دیار نییەو ڕوون نییە دای بەکێ بەڵام کە وتت عِلِيًّا، دای بە عەلی كِتَابًا کتێبێک، یانی بە فعل و فاعل ئیشەکەت ناڕوا دەبێت مفعول بە یش خۆی پیاکا.]] ئیتر ئاوا یان فعلێکی لازمی لەدوا دێت وەکو جاء، یان فعلێکی موتەعەددی کە مفعولەکەشی لەگەڵی هاتووە وەک كم رجلا زارك،((ئێستا سەیربکەین، زار محمدٌ بكرًا، محمد سەردانی کرد کە دیار نییە دەبێ کەسێک هەبێت کە سەردانی کردبێت بۆیە پێویستی بە مفعول بە ـیە دەڵێیت بەکر سەردانی بەکری کرد، مادەم تەنها بەتەنها زار محمد تەواو نابێت دەشبێت بزانیت سەردانی کێی کردووە کەواتە تەواونابێت بەبێ ئەوەی بزانین مفعول بە ـەکە چییە یانی دەبێ مفعولێکت هەبێ ڕستەکە تەواو بکات کەواتە دەزانیت موتەعەددیە)) مفعولەکەش ئەوەتا کافەکەیە(كم رجلا زارك، یانی کەسێک هەستاوە بەسەردان کردنی تۆ، چەند پیاو سەردانی تۆی کردووە)، یان زەرفێک لەدوایەوە دێت(عند، تحت ، فوق، ئەونیتریش) ، وەکو(كم كتابا عندك، عند خۆی زەرفە مزافیشە، کافەکەش لە محل جردا دەبێتە مزاف الیە، وتیشمان ئەوشتانە دەبێتە زەرف ،چوونکە شبە جوملە یان زەرف و مزروفە یان جار و مجرورە )، یان جارو مجرورمان هەیە وەکو:{ كم رجلا في الدارِ، کە في حرف جرە الدار اسم مجرورە.

ئەگەر هەریەکێک لەئەمانە بوو ئەوا دەڵێیت:

**إعـــراب (كم):**

لِـمَعْرِفَةِ مَوْقِعِهَا الإِعْرَابِيِّ نَنْظُرُ إِلَى مَا بَعْدَ تَمْيِيزِهَا:

**أَوَّلًا:** تُعْرَبُ **فِي مَحَلِّ رَفْعٍ مُبْتَدَأً** إِذَا كَانَ مَا بَعْدَ التَّمْيِيزِ:

١- فِعْلًا لَازِمًا، نَحْوُ: (كَمْ رَجُلًا جَاءَ؟)، أَوْ فِعْلًا مُتَعَدِّيًا اسْتَوْفَى مَفْعولَهُ، نَحْوُ: (كَمْ رَجُلًا زَارَكَ؟)، أَوْ ظَرْفًا، نَحْوُ: (كَمْ كِتَابًا عِنْدَكَ؟)، أَوْ: جَارًّا وَمَجْرُورًا، نَحْوُ: (كَمْ رَجُلًا فِي الدَّارِ؟).

تُعْرَبُ فِي مَحَلِّ رَفْعٍ خَبَرًا إِذَا جَاءَ بَعْدَهَا اسْمٌ مَعْرِفَةٌ، نَحْوُ: (كَمْ مَالُكَ؟).

له محل رفعدا دەبێتە مبتدأ

یانی ئەگەر جارو مجرور یان زەرف یان لازم بوو یان موتەعەدیی، ئەوکات دەڵێیت کم لە محل رفعدا مبتدایە.

تُعْرَبُ فِي مَحَلِّ رَفْعٍ خَبَرًا إِذَا جَاءَ بَعْدَهَا اسْمٌ مَعْرِفَةٌ، نَحْوُ: (كَمْ مَالُكَ؟).

ئەگەر لەدوایەوە ناوێکی معرفە هات ئەوا لە محل رفعدا دەبێتە خبر، وەک(کم مالک، سامانی تۆ چەنێکە؟، کەواتە دەڵێیت ئەو کم لاستفهام مبنی علی السکون فی محل رفع خبر مُقدَّمُ( پێشخراو)
،مال: دەبێت مبتدأ مُأَخَّرُ مضاف(موبتەدای دواخراو و مزاف)
کافەکەش: فی محل جر مزاف الیە یە. )

١-مَفْعُولٌ بِهِ، إِذَا جَاءَ بَعْدَهَا فِعْلٌ مُتَعَدٍّ لَمْ يَسْتَوْفِ مَفْعُولَهُ، نَحْوُ: (كَمْ كِتَابًا قَرَأْتَ؟).

٢- خَبَرٌ، إِذَا جَاءَ بَعْدَهَا فِعْلٌ نَاقِصٌ، نَحْوُ: (كَمْ كَانَ عَدَدُ تَلَامِيذِكَ؟).

٣- مَفْعُولٌ فِيهِ، إِذَا جَاءَ بَعْدَهَا ظَرْفٌ، نَحْوُ: (كَمْ يَوْمًا صُمْتَ؟).

2-
ئیعرابەکەی ئاوایە فی محل نصب یان دەبێتە مفعول بە، یان خبر، یان مفعول فیە.

1-
دەبێتە مفعول بە: کاتێک فعلێکی موتەعەدی لەدوایەوە هات مەفعولەکەشی لەگەڵ نەهاتبوو
وەک:{کم کتابا قرأت، چەند کتێبت خوێندەوە، ئەگەر بێتوو بگەڕێنیەوە سەرەوە هی یەکەم کم رجلا زارکَ، مفعول بە هاتووە چەند پیاو سەردانتی کرد، زارک یانی سەردانی تۆی کردووە ئەوەتا مفعولەکە ئەو کافەیە، بەڵام لێرە مفعول بە یەکە نەهاتووە کم کتابا قرأت، کم ـمان هەیە وە کتابا ئەوە تەمیزەکەیەتی قرأت یانی تۆ خوێندووتەتەوە قرأت موتەعەدیە بەڵام مفعول بە یەکە نەهاتووە خوێندوتەتەوە بەڵام دیار نییە چیت خوێندۆتەوە گۆڤارە کتێبە چییە، ئێستا دەڵێیت من خوێندمەوە چیت خوێندەوە گۆڤار کتێب پەڕ چی یانی بەبێ مفعول بە ئیشەکە ناڕوات، وەمادەم مفعول بە نەهاتووە دەڵێیت کم لە محل نصب مفعول بە یە.

ثَانِيًا: تُعْرَبُ فِي مَحَلِّ نَصْبٍ عَلَى أَنَّهَا:

١-مَفْعُولٌ بِهِ، إِذَا جَاءَ بَعْدَهَا فِعْلٌ مُتَعَدٍّ لَمْ يَسْتَوْفِ مَفْعُولَهُ، نَحْوُ: (كَمْ كِتَابًا قَرَأْتَ؟).

٢- خَبَرٌ، إِذَا جَاءَ بَعْدَهَا فِعْلٌ نَاقِصٌ، نَحْوُ: (كَمْ كَانَ عَدَدُ تَلَامِيذِكَ؟).

٣- مَفْعُولٌ فِيهِ، إِذَا جَاءَ بَعْدَهَا ظَرْفٌ، نَحْوُ: (كَمْ يَوْمًا صُمْتَ؟).

٤- مَفْعُولٌ مُطْلَقٌ، إِذَا جَاءَ بَعْدَهَا مَصْدَرٌ، نَحْوُ: (كَمْ ضَرْبَةً ضَرَبْتَ؟).

ثَالِثًا: فِي مَحَلِّ جَرٍّ، عَلَى أَنَّهَا:

2-

یان دەبێتە خبر: ئەگەر لەدوایەوە فعلێکی ناقس لەدوایەوە هات(ئێمە وتمان خبری فعلە ناقسەکان وەک کان و خوشکە کانی منسوبن) وەک:{ كم كان عدد تلاميذك، ژمارەی فێرخوازەکانت چەند بوو، مادەم کان لەدوای کم هاتووە کم في محل نصب دەبێتە خبری کان(خبری کان ـەش منسوبە)

3-

یان دەبێتە مفعول فيه: ئەگەر لەدوایەوە زەرف هات(مەبەستمان زەرفی زەمانە ئەوەی تحت و فوق و ئەوانی تریشیان ناڵێین) وەک:{کم یوما صمت، چەند ڕۆژ بەڕۆژوو بوویت، کەواتە کم في محل نصب دەبێتە مفعول فيه

4-

،یان دەبێتە مفعول مطلق: ئەگەر لەدوایەوە المصدر {چاوگێک}هات، وەکو{کم ضربة ضربت چەند لێدان لێت دا} کم في محل نصب دەبێتە مفعول مطلق.

3-

ثَالِثًا: فِي مَحَلِّ جَرٍّ، عَلَى أَنَّهَا:

١- مَجْرُورَةٌ بِحَرْفِ الجَرِّ، نَحْوُ: (بِكَمْ دِينَارٍ اشْتَرَيْتَهُ؟).

٢-مُضَافٌ إِلَيْهِ، إِذَا سَبَقَهَا اسْمٌ مُضَافٌ، نَحْوُ: (كِتَابَ كَمْ مُؤَلِّفٍ قَرَأْتَ؟).

٢- مضاف إليه، إذا سبقها اسم مضاف، كقولنا: درسَ كم أستاذٍ سمعتَ؟

تَنْبِيهٌ: تُعْرَبُ (كَمْ) الخَبَرِيَّةُ إِعْرَابَ الاِسْتِفْهَامِيَّةِ.

ئەوەیان لە محل جردایە ویش چەند جۆرێکە

1-
یان دەبێتە مجرور بە پیتێکی جر، وەکو:{بکم دینار اشتریتە، بەچەند دینار کڕیت، مادەم حرف جری لەپێش هاتووە دەڵێی کم في محل جر اسم مجرور}

2-
یان دەبێتە مزاف الیە: ئەگەر ناوێکی مزاف لە پێشیەوە هات( کتاب کم مؤلف قرأت، کتێبی چەند نوسەرت خوێندۆتەوە، کتێبی داوەتە پاڵ کم (چەند)، کتێبەکە مزافە کم لە محل جر دەبێتە مزاف الیە

خاڵەکەی تریش هەرئەوە هەر وای دانێن بوونی نییە.

تێبینی: کم ـی هەواڵی هەمان حالەتی کم ـی پرسیاری هەیە، ئیتر هەر حالەتێک لەحالەتەکانی ئەوی بەسەردا جێبەجێ بوو هەمان ئیعرابی ئەو وەردەگرێت.

---

وانەی: بیست و سێیەم

---

ئەگەر بیرتان بێت باسمان کرد کە جاری وایە لەباتی بەهێما ئێمە شتەکان مرفوع یان منسوب مجرور بکەین بەپیت دەیکەن وەک ئەوەی لەجیاتی بڵێیت إنَّ العالمَ(بەڕاستی زاناکە) دەڵێیت إنَّ العالِمِینَ(بەڕاستی زاناکان) جا لەسەرەتا بۆ یەک یەک کەس بوو بەس کە کردمان بەدوانو کۆ{سێ یان لەسێ زیاتر} دەیکەینە پیت ئاوا

سەرەتا بۆ المثنی(دووان)(مثنی مذکر سالم)
ئەگەر مرفوع بوو ئەوا {انِ} زیاد دەکەین، واتا ئەگەر شتەکە مرفوع بوو وەک جاء الصَّابرُ(ئارامگرەکەهات)، دەڵێین جاء الصابِرَانِ(دوو ئارامگرەکە هاتن) لێرە بۆیە جاء مان(نەدان نووسیوە جائا) نوسیوە دەبێت وابێت چوونکە یاساکە وایە ئەگەر بێت و (ان یان جمع و ئەوانی،تری بوو) ـیش لێبکەینەوە دەبێ هەر واتا بدات واتا جاء الصابر واتا دەدات واتا ئارامگرەکە هات کە کردمانەدووان جاء الصابران کە ئەو ان لێکردەوە نابێ واتا کە تێک بچێت.

وەک کتاب-->کتابانِ

ئەگەر منصوبو مجرور بوو-->کتابَیْنِ، ئەگەر ناوەکە مجرور یان مەنسوب ینِ زیادەکەین، وەک

هما من الصابرَيْنِ، یان رأیت الصابرَینِ، كە لەیەكەم مجرورە بە حرف جر لەدووەم مەنسوبە چوونكە مفعول بەیە.

(مثنى مؤنث سالم)
وە بۆ مێینەش هەمان شت بەس یەک ت دەخەیتە پێش ئاوا رأیت الصابرتَیْنِ، یان هما من الصابرتَیْنِ.

{وە بۆ كۆ لە نێر{جمع المذكر السالم}

لە رفعدا ونَ لە نسبو جر ینَ، وەک رأیتُ الصابِرینَ، یان هم من الصابرِینَ، یان جاء الصابرِونَ، واتا ئەگەر ئائەم جەمعانە لاببەین وە لە حرف بیكەینەوە هێما ئاوا دەبێت رأیت الصابرَ، من الصابرِ، جاء الصارُ، تەنها لەو هێمایانەوە گۆڕیمانن بۆ كۆ وە پیت.

{وە بۆ مێینەش لەكۆدا{جمع المؤنث السالم}:
لەدۆخی رفعدا اتُ، وە لەنەسبو جردا اتِ، وەک رأیت الصابرَاتِ، هُنَّ من الصابراتِ، یان هؤلاءِ صابراتُ، كە دەزانین اسم ئیشارە موبتەدایەو موبتەداش مرفوعە وە الصابرات خەبەرەو وە خەبەریش مەرفوعە.

جمع التكسیر ـش مان هەیە وەک قلم اقلام یان رجل رجال، ئەمەیان یاسایەكی ڕێكی نییە وەک ئەوانی تر بەكورتی ئەشواییە دەبێ بگەڕێیتەوە قاموس لەمەیان بەیاساو شت زەحمەتە وەک ئەوی تر نییە.

وانەی بیستو چوارەم

---

المعرفة، النكرة، المذكر، المؤنث

## المَعْرِفَـــةُ :

**المَعْرِفَةُ:** هُوَ مَا دَلَّ عَلَى مُعَيَّنٍ، وَهُوَ عَلَى سِتَّةِ أَقْسَامٍ:

**العَلَمُ:** وَهُوَ الاِسْمُ الَّذِي يَدُلُّ عَلَى مُسَمَّاهُ بِذَاتِهِ، نَحْوُ: (مُحمَّدٍ، وَزَيْدٍ، وَبَكْرٍ).

**المُضْمَرُ:** وَهُوَ اسْمٌ جَامِدٌ مَبْنِيٌّ وُضِعَ لِيَدُلَّ عَلَى: مُتَكَلِّمٍ، أَوْ مُخَاطَبٍ، أَوْ غَائِبٍ، نَحْوُ: (أَنَا، وَأَنتَ).

المعرفة(ناسراو): ئەوەیە کە گوزارشت بکات لەشتێکی دیاری کراو شتێکی دیار(ئێستا ①- نەکیرە کۆمەڵێکی شت دەگرێتەوە، ئێستا کە تۆ دەڵێیت رجل ئەوەی کە پێی بوترێت پیاو دەیگرێتەوە، بەڵام المعرفة ئەوەیە کە گوزارشت بکات لەشتێکی دیاری کراو)، ئەویش چەند جۆرێکە

1-
العلم(ناوی شتەکانە بەتایبەت نیشانکراو): ئەوەیە کە گوزارشت دەکات لەناو نراوەکە بەخودی خۆی یانی پێویستی بەهیچی تر نییە(یانی کە تۆ دەڵێیت محمد گوزارشت دەکات لە محمد کە ناونراوەکەیە بە خودی خۆی، یانی هەر ئەوەندەی بڵێیت محمد گوزارشت دەکات لەو کەسەی کە ناو نراوە محمد)

2-
المضمر(جێناو): ناوێکی جامدە(واتا لەهیچەوە وەرنەگیراوە موشتەق نییە، ئێستا مصدر وثعل متضي مضارع امر اسم فاعل هەموویان لێک وەرگیراون یان لەشتێکی تر وەرگیراون، بەڵام ئەو شتەی کە ناگۆڕێ هیچی لێ وەرنەگیراوەو لەهیچیش وەرنەگیراوە ئەوا جامدە ) مەبنیە (وتا معرب نییە) داندراوە بۆ گوزارشت کردن لەسەر قسەکەرێک(نحن، انا...)، یان ئامادە یان نادیار،وەک(انا، انت)

اسْمُ الإِشَارَةِ: وَهِيَ أَسْمَاءٌ وُضِعَتْ لِيُشَارَ بِهَا إِلَى مُعَيَّنٍ، نَحْوُ: (هذَا، وَهذِهِ).

اسْمُ الـمَوصُولِ: وَهُوَ مَا يَدُلُّ عَلَى مُعَيَّنٍ بِوَاسِطَةِ جُمْلَةٍ أَو شِبْهِهَا بَعْدَهُ، وَتُسَمَّى صِلَةَ الـمَوصُولِ، نَحْوُ: (جَاءَ الَّذِي أَكْرَمْتُهُ). وَهذَانِ القِسْمَانِ يُقَالُ لَهُمَا: الـمُبْهَمُ أيضًا.

3- اسم الاشارة: كۆمەڵە ناوێکن داندراون بۆ ئاماژە کردن بۆ دیاری کراوێکٍ، وەک: (هذا، هذه، کە هەردووک بۆ نزیکن، یان لەجێی هذا، ذلك کە بۆ دوور یان لەجێی هذه, تِلكَ، لەسەرێ لەبەشی ناوی ئاماژە گشتیمان دیاری کردووە بەواتاوە دەتوانن بگەڕێنەوە.)

الاسمُ الموصولُ: ئەوەیە کە گوزارشت دەکات لەسەر شتێکی دیاری کراو بە واستەی ڕستەیەک یان هاوشێوەی ڕستەیەک کە لەدوایەوە دێت کە ناودەندرێ سیلەی موسول،وەک(جاء الذي اکرمته، کاتێک دەڵێیت جاء الذي نازانی چییە ئەو اکرمته کە لەدوایەوە دێت ڕوونی دەکاتەوە، یانی بەواستەی الذي کە اسم موسولە وە ئەو جوملەی کە لەدوای هاتووە کە اکرمته ـوە بەواستەی ئەو دووە ڕستەکە ڕوون بۆتەوە ئەبێت بە معرفة، یانی کە دەڵێیت هات ئەوەی کە، نازانی کێیە بەڵام کە وتت اکرمته ئنجا دەزانیت کە ڕێزم لەکێ ناوە یان کێ هاتووە یانی بەواستەی ئەو جوملەو شبە جوملەیە کە لەدوایەوە دێت کارەکە ڕونەبێتەوە و دەبێتەو دەبێتە معرفة )، وە ئەو دووجۆرە اسم اشارەو موسولە پێیان دەوترێت: المبهم (شاردراوە، نادیارکراو).

4- ال: ئەوەیە کە ال تعریفی چۆتە سەر: ئەویش دیارە.

5- شتێک کە ئیزافە بکرێت پاڵبدرێت زیاد بکرێت بۆ لای ئەم مەعریفانە(واتا چوار خاڵی پێشوو کە خوێندمان ئیتر موسولە بێت یان ئیشارە یان ال یان علم)، نموونە{کتاب محمد(کتێبەکەی محمد)، کتاب نکرەیە بەڵام کە دراوەتە پاڵ محمد بۆتە مەعریفە بەواستەی محمد) یان کتاب الرجل،کتێبی پیاوەکە، الرجل بەواستەی ال بۆتە معرفە وە کتاب بەواستەی ئەوەی دراوەتە پاڵ الرجل بۆتە معرفە یانی کتاب مزافە الرجل لەگەڵ محمد مزاف الیە ـن)

تَنْبِيْهٌ: قَدِ اخْتَلَفَ العُلَمَاءُ فِي تَحْدِيدِ أَعْرَفِ الـمَعَارِفِ وَتَرْتِيْبِهِ بَعْدَ اسْمِ الجَلَالَةِ عَلَى أَقْوَالٍ، فَذَهَبَ سِيْبَوَيْهِ وَمَنْ وَافَقَهُ إِلَى أَنَّ الضَّمِيرَ أَعْرَفُ الـمَعَارِفِ، ثُمَّ الِاسْمُ العَلَمُ، ثُمَّ الِاسْمُ الـمُبْهَمُ، ثُمَّ مَا فِيْهِ الأَلِفُ وَاللَّامُ، وَأَعْرَفُ الضَّمَائِرِ ضَمِيْرُ الـمُتَكَلِّمِ؛ لِأَنَّهُ لَا يُشَارِكُهُ فِيْهِ أَحَدٌ غَيْرُهُ، فَلَا يَقَعُ فِيْهِ الْتِبَاسٌ.

تێبینی: زانایان ڕاجیاییان هەیە کە کامیان لەوانەی خوێندمان لەو پێنج خاڵە کامە لەگشتیان مەعریفەترە ناسراوترە دوای ناوی الله(چونکە بە تەواوی وتوتیان ناوی الله لەهەموو مەعرفەیەک مەعرفە ترە بەڵام ئەی کامە لەدوای ناوی الله معرفەترە؟)، سیبەوەی لەگەڵ ئەوانەی پەسەندیان کردووە وتوتیان جێناو لە گشت مەعریفەکان معرفە ترە، پاشان ناوی علم(نیشانکراو)، دواتر ناوی نادیار(یانی ناوی موسول)، پاشان ال، وە ناسراوترینیان لەناو جێناوەکانیش جێناوی قسەکەرە، لەبەر ئەوەیە کەس بەشداری نابێت جگە لە خۆی(واتە قسەکەرەکە کە دەڵێی من ڕۆیشتمە بازاڕ جگە لەتۆ کەسی تر ناگرێتەوە، وەکو کۆنییە بڵێی ڕۆیشتینە بازاڕ ئێ کێو کێ ڕۆیشتن، یان دەڵێیت أكلت، خواردم، جگە لەتۆ کەسی تر ناگرێتەوە) هیچ تێکەڵیەک تیایدا ڕونادات.

## النَّكِـــرَةُ :

النَّكِرَةُ: مَا دَلَّ عَلَى غَيْرِ مُعَيَّنٍ، أَو مَا شَاعَ فِي جِنْسِهِ، نَحْوُ: (امرَأَةٍ، وَرَجُلٍ). فَإِنَّ كُلًّا مِنِ (امْرَأَةٍ)، وَ(رَجُلٍ) يَدُلُّ عَلَى جِنْسِهِمَا دُونَ إِخْرَاجِ وَاحِدٍ.

## الـمُذَكَّرُ :

الـمُذَكَّرُ: هُوَ مَا خَلَا آخِرُهُ مِنْ عَلَامَاتِ التَّأْنِيثِ، كـ: (زَيْدٍ، وَمحمَّدٍ).

②-

النكرة(نەناسراو): ئەوەیە کە گوزارشت بکات لە شتێکی دیاری نەکراو(یانی کۆمەڵێک شت دەگرێتەوە، وەک ذهبَ رجلٌ پیاوێک ڕۆیشت دیار نییە(چونکە پیاو گوزارشت دەکات لە کۆمەڵێک شت وە بەبێ ال تعریف یان ەکە ـەی ناسینەوە نازانرێ کێیە) بەڵام بڵێی ذهب الرجلُ پیاوەکە ڕۆیشت دیاری کراوە بەهۆی (ەکە)وە دەبێتە معرفة.)یان ئەوەی لە ڕەگەزی خۆی بڵاو

بێتەوە یانی کۆمەڵێک شت بگرێتەوە، بۆنموونە دەڵێی عَبد، کۆمەڵێک شت دەگرێتەوە هەرکێ کە بەندە بێت دەیگرێتەوە،{ ئێستا عبد ناوویکە لەڕەگەزی رجل بۆ نموونە کە رجل ڕەگەزە امرأة ڕەگەزە، یانی ئەو عەبدە لەڕەگەزی رجل ناوێکی بەربلاوە یانی بۆ سەتان و هەزاران بەکار دێت یان لەهی ئافرەتیش جارية کە بۆ سەتان و هەزاران بەکار دێت کە لەڕەگەزێکی ئافرەتە.} وە هەردووک پیاو و ئافرەت گوزارشت دەکەن لە ڕەگەزەکەیان بەبێ ـەوەی هیچی دەربچێ واتا کە وتت ژن هەموو ژنێک دەگرێتەوە وتت پیاو هەموو پیاوێک یەکدانەشی تیا دەرناچێ مەگەر یەکێ پیاو نەبێت.{ئەوەشی کە دەڵێت لەڕەگەزی خۆی بلاوەبێتەوە بۆنموونە هەریەک لە پیاو و ئافرەت لەو ڕەگەزە کوڕو کچی لێ دەبێتەوە کە بەملیۆنەها دەگرێتەوە. بەکورتی شتێکی دیاری کراو نییەو کۆمەڵێک شت دەگرێتەوە بەبێ دیاری کراویەتی ئەو شتانە.

③-

ئەوەیە کە کۆتاییەکەی خالیو بەتاڵ بێت لە نیشانەکانی تأنيث(نیشانەی مێ)، وەک (زيد، محمد)

**المُؤَنَّثُ:**

**المُؤَنَّثُ:** هُوَ مَا فِيْهِ عَلَامَةٌ مِنْ عَلَامَاتِ التَّأْنِيثِ، وَهِيَ تَاءُ التَّأْنِيثِ، وَالأَلِفَانِ: الـمَقْصُورَةُ وَالـمَمْدُودَةُ، نَحْوُ: (فَاطِمَةَ، وَحُبْلَى، وَحَمْرَاءَ).

وَالتَّأْنِيثُ عَلَى ضَرْبَيْنِ: **حَقِيقِيٌّ:** وَهُوَ مَا يَكُونُ بِإِزَائِهِ مُذَكَّرٌ مِنَ الحَيَوَانَاتِ، كَالنَّاقَةِ فَبِإِزَائِهِ الجَمَلُ. **وَغَيْرِ حَقِيقِيٍّ:** وَهُوَ عَكْسُهُ، كَـ: (البُشْرَى، وَالظُّلْمَةِ).

④-

المؤنث: ئەوەیە کە نیشانەیەک لە نیشانەکانی تأنيثی(یانی ئەوەی کە شتەکە دەکاتە مێ، یانی دەزانی مێیە پێی) پێوەبێت، وەئەوانیش تاء التأنيث(وەک فاطمة)، وە دوو ـەلفەکە، ئەلفی مقسورە(حبلی) وە ممدودە(حمراء).

وە التأنيث(مؤنث) دووجۆرە حقيقي وغير حقيقي(مجازي ـشی پێ دەوترێت): حقيقي: ئەوەیە کە لەبەرامبەریدا موزەکەرێکمان هەبێت لە ئاژەڵەکان، وەک الناقةِ(کە بەو تاء ـە بۆتە مێ) کە لەبەرامبەریدا الجمل هەیە(کە بۆ نێرینەیە){یانی مؤنث ـی حقيقي ئەوەیەکە لەبەرامبەریدا نێرێک هەبێت،

وغير حقيقي پێچەوانەی ئەوە(واتا لەبەرامبەریدا نێرینەیەک نییە): (البشری(مژدە) الظلمة(تاریکی)کە تاریکی و مژدە لەبەرامبەریان نێرێک نییە تا زاوزێ بکەن{هەر تا لێتان ئاڵۆز نەبێت بۆنموونە پیاو نێرە لەبەرامبەریدا ئافرەت هەیە کە مێیەو تەواوکەری یەکن و زاوزێ

دەکەن کەوەتە حقیقي ـن.بەڵام ئێستا پەرتووک بۆ نموونە نێرە ئایا هیچ مێیەک لەبەرامبەریدا هەیە نا کەواتە غیر حقیقي ـیە ، وەشتێک بزانە هەرشتێک دوان بوو دەکرێتە مێ لە غیر حقیقي وەکو (نەعل یان چاو یان دەست یان پێ گوێ هەموویان مێن وە ئەوەی یەکە وەک لووت نێرن.)

ئەو نێرو مێیە ئەوەیە کە جێناوی بۆ دەگەڕێنیتەوە بزانیت ئایا بە نێر بۆی دەگەڕێنیەوە یان مێ واتا ،وەت البشری چوونکە بە مێ هاتووە دەبێ جێناوی مێشی بۆ بگەڕێتەوە وە بۆ نێریش ئاوا لەئەوانی تریشدا کۆو جووتیەتیشیان.

فَالحَقِيْقِيُّ أَقْوَى وَلِذلِكَ امْتَنَعَ تَجْرِيدُ فِعْلِهِ مِنْ تَاءِ التَّأنِيثِ وَلَا تَقُولُ: (جَاءَ عَائِشَةُ)[1]، بِخِلافِ: (طَلَعَ الشَّمْسُ)، فَإِنَّهُ جَائِزٌ. وَلكِنْ إِذَا فُصِلَ بَيْنَ الفِعْلِ وَالفَاعِلِ فِي الأَوَّلِ جَازَ، نَحْوُ: (جَاءَ اليومَ عَائِشَةُ)، وَحَسُنَ فِي الثَّانِي مَعَ الفَصْلِ، نَحْوُ: (طَلَعَ اليومَ الشَّمْسُ).

أَمَّا إِذَا تَأَخَّرَ الفِعْلُ فَإِنَّهُ يَتَعَيَّنُ إِلْحَاقُ التَّاءِ، نَحْوُ: (الشَّمْسُ طَلَعَتْ).

موئەنەثی حقیقی بەهێزترە بیە ناتوانیت تاء تەئنیث لە فعلەکەی بکەیتەوە(مەبەستمان ـئەم ثْ ـئەیە کە وادەکا کارەکە بۆ ئافرەت بگەڕێنێتەوە)، یانی ناتوانیت بڵێیت جاء عائشةُ، بەپێچەوانەی طلع الشمس یانی دەتوانیت بڵێیت طلع الشمس وە یان طلعت الشمسُ، لەبەر ئەوەی مؤنث ـەکەی حقیقي نییە چوونکە لەبەرامبەریدا نێرینەیەک نییە (مەبەستمان پێی ئەوەیە زاو زێ بکەن وەک ئاژەڵ یان مرۆڤ یان هەرشتێکی تر، نەوەک بڵێن ئەوەتە القمر هەیە لەبەرامبەریدا نا مەبەستمان لەوەیە کە نێرو مێکە زاو زێبکەن)، وەبەڵام ئەگەر جیاکردنەوە کەوتە نێوان فعل و فاعلەکەوە(واتا یەکی تر خۆی کردە نێوانیان)ئەوکات لە مؤنث ـی حقیقي ـیش درووستە وەکوو(جاء الیوم عائشة)،مادەم ،الیوم خۆی پیاکردەوەو کەوتۆتە نێوانیان درووستە تاء ـەکە لاببەیتیانی ئەوە( جاءتِ الیومُ عائشةُ ئێستا لەوەیە بپرسی ئەو تاء بەحیساب ساکنە بۆ کەسرەی لەژێرە ئەوە ئەگەر ناوەکەی پێشی ال ـپێوە بوو سکونەکە دەکرێتە کەسرە، وە شتێک بزانە یانی دەشتوانی لێشی نەکەیتەوە ئەو تاء ـە وە دەشتوانی بشی نوسیتەوە یانی بەبێ تاء وە بە تاء ـیشەوە لەو حالەتە درووستە)، وەکاتێک جیاکردنەوە دێتە نێوانیان دەتوانی تائەکە لێی بکەیتەوە دەشتوانی تاءەکە لێنەکەیتەوە بەکەیفی خۆت بەس باشتر لێی نەکەیتەوە وە بەس لەو حالەتە درووستە نەک لەگشت کاتێک یانی کە وتت جاءت عائشة مادەم جیا کردنەوە نەبو دەبێ هەر بینووسی، بەڵام لە غیر حقیقي بەبێ جیابوونەوە درووستە بەڵام کە جیابوونەوە کەوتە نێوانیان جوانترو باشتر وایە تائەکە لێبکەیەوە.

بەڵام ئاگادار بە ئەگەر فعلەکە دواکەوت و فاعلەکە پێشکەوت ئەوا واجبە تائەکە بنووسیت وەکو الشمس طلعت، نەڵێی مؤنث ـەکە غیر حقیقي یە نا لەو حالەتە پێویستە بینووسی ناتوانی نەینوسی.

تَنْبِيْهٌ: هُنَاكَ أَسْمَاءٌ يَشْتَرِكُ فِيهَا الْمُذَكَّرُ وَالْمُؤَنَّثُ، مِثْلُ مَا كَانَ عَلَى (فَعُولٍ)، بِمَعْنَى فَاعِلٍ، كَقَوْلِكَ: (رَجُلٌ صَبُورٌ)، وَ(امْرَأَةٌ صَبُورٌ)، أَيْ: صَابِرَانِ. وَ(فَعِيلٍ)، بِمَعْنَى مَفْعُولٍ، كَقَوْلِكَ: (رَجُلٌ قَتِيلٌ)، وَ(امْرَأَةٌ قَتِيلٌ)، أَيْ: مَقْتُولَانِ.

تێبینی: کۆمەڵە ناوێک هەیە نێرو مێ تیایدا وەک یەک وایە، واتا ناچیت تائێکی پێوەبکەیت بڵێیت دەیکەمە مێ، ئەگەرلەسەروەزجی {فعول} ـێک بوو وەبەمانای فاعلێک بوو، وەک{رجل صبور}و{امرأة صبور}، یانی کە دەڵێیت پیاوێکی ئارامگر یان ئافرەتێکی ئارامگر، یانی کەدەڵێیت پیاوێکی ئارامگرە یان ئافرەتێکی ئارامگر خستتە سەر وەزنی فعول مادەم مەبەستت پێت فاعلە(مەبەست اسم فاعلە) کە دەڵێیت ئارامگرە ئەوکەسەی ئارام دەگرێت یان نێرو مێ تیایا وەک یەکە ناڵێیت امرأة صبورة، مادەم هەردوویان ئەو فعولە مەبەستت پێی فاعلە ئەوا نێرو مێ تیایا وەک یەکە، وەئەگەر لەسەر وەزنی {فعیل} بوو بەمانای مفعول بوو ، [مفعول ئەوەیە کارەکەی ،لەسەر کراوە فعل ئەوەیە هەڵدەستێت بەکارەکە]، وەک قسەت: {رجل قتیل(پیاوێکی کوژرا} و{امرأة قتیل}، لێرە لەئافرەتەکە ناڵێیت قتیلة مادەم لەسەر وەزنی فعیلەو مەبەستت پێی کوژراوە (مَقتُول) ئەوا نێرو مێ تیایا وەک یەکە، ،یانی فعول ـێک کاتێک کە هەڵدەستن بەکارەکە یان فعیل ـێ کاتێک کە کارەکەیان لەسەر دەکرێت ئەوا نیشانەی تأنیث دانااندرێت بەڵکو هەر وەک نێر دەنووسرێ،واتا ئەوەی لەسەر وەزنی فعولە بەمانای فاعلە وە ئەوەی لەسەر وەزنی فعیل بەمانای مفعول، یانی فعولێک کاتێک کە هەڵدەستێت بەکارەکە وە فعیلێک کاتێک کە کارەکەی لەسەر دەکرێت نێرو مێ وەک یەکە وەبەدوای نیشاجەی تأنیث ناگەڕێین.

---

وانەی بیستوو پێنجەم

---

المصغر، هەنێک لەژمارەکان

المصغَّر((بچووککراوە)(التصغیر(بچووککردنەوە))
بریتیە لە بچووککردنەوە، یانی ناوێکمان هەیە دەیخەینە سەر وەزنێک بچووکەبێتەوە وە چەند مەبەستێک هەیە لەمەدا

## المُصَغَّـــرُ:

**الـمُصَغَّرُ:** هُوَ مَا ضُمَّ أَوَّلُهُ، وَفُتِحَ ثَانِيْهِ، وَزِيْدَ قَبْلَ ثَالِثِهِ يَاءٌ سَاكِنَةٌ، كَـ: (رُجَيْلٍ، وَطُفَيْلٍ). **أَمَّا الرُّبَاعِيُّ** فَيَكُونُ عَلَى وَزْنِ (فُعَيْعِلٍ)، كَـ: (طُوَيْلِبٍ، وَخُوَيْلِدٍ)، مِنْ (طَالِبٍ، وَخَالِدٍ). **وَالخُمَاسِيُّ** عَلَى (فُعَيْعِيلٍ) بِزِيَادَةِ يَاءٍ، نَحْوُ: (دُنَيْنِيرٍ)، مِنْ (دِينَارٍ).

---

(١) تَقُولُ: جَاءَتْ عَائِشَةُ.



المصغر:{لێرە باسی ئەوەدەکات چۆن درووستەکرێت دواتر هەر گشت جۆرەکانتان بۆ دادانێم إن شاء الله.}

وَالتَّصْغِيرُ يَكُونُ لِأَغْرَاضٍ، **كَالتَّحقِيرِ** فِي مِثْلِ: (رُجَيْلٍ)، **وَالـمَحَبَّةِ**، فِي: (أُنَيْسٍ)، **وَالتَّقْلِيلِ**، فِي: (سُوَيْعَةٍ)، **وَالتَّقرِيبِ**، فِي: (قُبَيْلَ العَصْرِ، بُعَيْدَ الـمَغْرِبِ)، **وَالتَّصْغِيرِ**، فِي: (كُتَيِّبٍ).

وە بۆ چەند مەبەستێک دەکرێت: بۆبچوککردنەوەی کەسێک{وەک سوکایەتی}، وەک رجل{پیاو} بکەیتە رُجَیل{پیاوەچکە}، وەجاری وایە بۆ خۆشەویستیە وەک أَنَس دەیکەیتە أنیس، وەجاری وایە ،بۆ کەمکردنەوەیە ساعة بووە بە سویعة، یانی کاتەکە کەمەکەیتەوە(بۆنموونە لەسەعاتێک کەمتر) وە جاری واشە بۆ نزیککردنەوە { لەباباتی بلێیت قبل العصر دەڵێیت قبيل العصر (یەک تۆز پێش عەسر}، یەکتۆز دوای ئێوارێ، وەجاری وایە وەک بچووک کردنەوە، کتاب بۆتە کتیب{نامیلکە} واتا کتاب نییە لەو بچووکترە.

## الـمَنسُوبُ:

**الـمَنْسُوبُ (النِّسْبَةُ):** هُوَ مَا لَحِقَتْ آخِرَهُ يَاءٌ مُشَدَّدَةٌ تَدُلُّ عَلَى نِسْبَةِ شَيءٍ إِلَيْهِ، نَحْوُ: (بَغْدَادِيٍّ، وَشَامِيٍّ، وَمِصْرِيٍّ).

**تَنْبِيهٌ:** تُحْذَفُ تَاءُ التَّأْنِيثِ عِنْدَ النِّسْبَةِ مُطْلَقًا، فَتَقُولُ فِي النِّسْبَةِ إِلَى (البَصْرَةِ): البَصْرِيُّ.

المنسوب(النسبة){واتا دانەپاڵ شتێک بدەیتە پاڵ شتێک}: ئەوەیە کە یاء ێک کە شەددەی هەیە لکاوە بەکۆتاییکەیەوە کەگوزارشت دەکات لەدانەپاڵی شتێک بۆلای یانی شتێکت داوەتە پاڵی، وەک نموونەکان{بغدادي، وشامي، ومصري, هەریەک لەمانە کە یاء ـەکەیان شەددەی هەیە گوزارشت دەکات لەوەیە کە کەسێکت یان شتێکت داوەتە پاڵ بەغداد یان شام یان میسر، بۆ منوونە الشِعرُ الکُردِيُّ تۆ لێرە شعرت داوەتە پاڵ کوردی کە واتا هۆنراوەی کوردی، ناڵێی کورد دەڵێی کوردی چوونکە لەوێ نەت وت الشعر الكرد(هۆنراوەی کورد) وتت الشعر الكردي{هۆنراوەی کوردی}.، لەگەڵ کوردی خۆمان نزیکە.

تێبینی: تاء ـی مێکردن لەکاتی ئەو دانەپاڵە دەسڕدرێتەوە بەتەواوەتی{نموونەکەش ڕوونە}، وە پێش یاء ـەکەش دەکەیتە کەسرە بۆ ئاسانکاری سەر زمان ناڵێی البصرَي بەڵکو دەڵێیت البصرِي.

## أَســمَاءُ العَــدَدِ

**أَسْمَاءُ العَدَدِ:** مَا وُضِعَ لِيَدُلَّ عَلَى كَمِّيَّةِ آحَادِ الأَشْيَاءِ، نَحْوُ: (وَاحِدٍ، وَاثْنَيْنِ، وَثَلَاثَةٍ). وَهِيَ ثَمَانِيَةُ أَقْسَامٍ:

ئەوەی کە داندراوە بۆ زانینی چەندیەتی شتەکان

هەشت بەشە:

## القِسْمُ الأَوَّلُ:

**الوَاحِدُ وَالِاثْنَانِ (١-٢):** يَتَوَافَقُ العَدَدُ وَالـمَعدُودُ تَذْكِيرًا وَتَأْنِيثًا، نَحْوُ قَوْلِكَ:

للمُذَكَّرِ: قَلَمٌ وَاحِدٌ. قَلَمَانِ اثْنَانِ.

للمؤنَّثِ: مَجَلَّةٌ وَاحِدَةٌ. مَجَلَّتَانِ اثْنَتَانِ.

1- ژمارەو ژمێردراو لە نێرو مێ وەک یەکن

**إِعْرَابُهُ:** الوَاحِدُ كَإِعْرَابِ صِفَةِ أَيِّ اسْمٍ مُفْرَدٍ، تَقُولُ: (هذَا قَلَمٌ وَاحِدٌ)[١] أَوْ مَجَلَّةٌ وَاحِدَةٌ، وَ(اشْتَرَيْتُ قلَمًا وَاحِدًا)[٢]، أَو مَجَلَّةً وَاحِدَةً، وَ(كَتَبْتُ بِقَلَمٍ وَاحِدٍ)[٣]، أَو مَجَلَّةٍ وَاحِدَةٍ.

وەک سیفەتی هەر ناوێکی تاک وایە ئیعرابی پێش خۆی وەرەگرێت
هذا موبتەدایە قلم خەبەرەکەیەتی واحد وەک سیفەت ئیعرابی ناوەکەی وەرەگرێت{نموونەکانی تریش ئاوا قلم چی وەرگرت واحد وەک وی وەرەگرێتەوە}.
ئا ئەمانەش ئیعرابەکان بۆ ئاسانکاری:

(١) هذَا: اسْمُ إِشَارَةٍ مَبْنِيٌّ عَلَى السُّكُونِ فِي مَحَلِّ رَفْعٍ مُبْتَدَأٌ. قَلَمٌ: خَبَرٌ مَرْفُوعٌ. وَاحِدٌ: صِفَةُ (قَلَم) صِفَةٌ مَرْفُوعٍ مَرْفُوعٌ.

(٢) اشْتَرَيْتُ: فِعْلٌ وَفَاعِلٌ. قَلَماً: مَفْعُولٌ بِهِ. وَاحِدًا: صِفَةُ (قَلَماً) صِفَةُ مَنْصُوبٍ مَنْصُوبٌ.

(٣) كَتَبْتُ: فِعْلٌ وَفَاعِلٌ. البَاءُ: حَرْفُ جَرٍّ. قَلَمٍ: اسْمٌ مَجرُورٌ بِالكَسْرَةِ. وَاحِدٍ: صِفَةُ (قَلَمٍ) صِفَةُ مَجْرُورٍ مَجرُورٌ.

أَمَّا الاثْنَانُ فَإِعْرَابُهُ كَإِعْرَابِ صِفَةِ الـمُثَنَّى، تَقُولُ: (هذَانِ قَلَمَانِ اثْنَانِ)[١] وَمُجَلَّتَانِ اثْنَتَانِ. وَ(اشْتَرَيْتُ قَلَمَيْنِ اثْنَيْنِ)[٢] وَمَجَلَّتَيْنِ اثْنَتَيْنِ. وَ(كَتَبْتُ بِقَلَمَيْنِ اثْنَيْنِ)[٣] وَمَجَلَّتَيْنِ اثْنَتَيْنِ.

بەڵام دووەم ئیعرابی وەک ئیعرابی سیفەتی دوانە(کە وتت هذان قلمان اثنان یانی وەک هی یەکەم ناوەکەی چی وەرگرت ئەوە وەرەگریت.

2-

**القِسْمُ الثَّانِي:**

**الثَّلاثَةُ إِلَى العَشَرَةِ (٣-١٠) (العَدَدُ الـمُفْرَدُ):** يُخَالِفُ العَدَدُ الـمَعْدُودَ، وَيَكُونُ الـمَعْدُودُ مَجْمُوعًا مَجْرُورًا، نَحْوُ قَوْلِكَ:

لِلمُذَكَّرِ: ثَلَاثَةُ أَقْلامٍ. سَبْعَةُ أَبْحُرٍ. تِسْعَةُ أَنْهَارٍ. عَشرةُ رِجَالٍ.

لِلمؤنَّثِ: ثَلاثُ مَقَالَاتٍ. سَبْعُ أَشْجَارٍ. تِسْعُ بَنَاتٍ. عَشْرُ نِسَاءٍ.

**إِعْرَابُهُ:** يُعْرَبُ العَدَدُ إِعْرَابَ الِاسْمِ الـمُفْرَدِ حَسَبَ مَوْقِعِهِ، وَيَكُونُ مُضَا **مُضَافًا**

سێ بۆ دە(پێشی دەوترێت ژمارەی تاک): ژمارەو ژمێردراو پێچەوانەی یەکن(ئەو نێر بوو ئەو مێیە وەئەو مێبوو ئەو مێیە)، وە ژمێردراو کۆدەکرێتەوەو{واتا دەکرێتە کۆ قلم دەکرێتە کۆ أقلام} وە هەمیشەش مجرورە: وەک

للمذکر: {ثلاثة أقلام، سێ پێنووسەکان} نموونەکانی تریش دیارن وە ژمێردراوەکان گشتیان مجرورن چوونکە دەبنە مزافو مزاف الیە وە کۆکراونەتەوە واتا بە جمع نوسراون نەک مفرد نەنوسراوە قلم یان بحر یان نهر یان رجل بەڵکو بەکۆ، وە ثلاثة کە بە مێیی هاتووە کە وتمان پێچەوانەی یەکن

للمؤنث: سبع أشجار(حەفت دارەکان)، نموونەکانی تریش دیارن وەک دەشبینین سبع نەنوسراوە سبعة کە وتمان جیاوازن.

ئیعرابەکەی:

للمؤنَّثِ: ثَلاثُ مَقَالَاتٍ. سَبْعُ أَشْجَارٍ. تِسْعُ بَنَاتٍ. عَشْرُ نِسَاءٍ.

**إِعْرَابُهُ:** يُعْرَبُ العَدَدُ إِعْرَابَ الِاسْمِ الـمُفْرَدِ حَسَبَ مَوْقِعِهِ، وَيَكُونُ مُضَافًا وَالـمَعدُودُ مُضَافًا إِلَيْهِ، تَقُولُ: (هذِهِ ثَلَاثَةُ كُتُبٍ)[٤]، وَ(قَرَأْتُ ثَلَاثَةَ كُتُبٍ)، وَ(نَظَرْتُ فِي ثَلَاثَةِ كُتُبٍ).

ژمارەکە بەپێی دۆخەکەی دەگۆڕێت ئایا مەنسوب دەبێت یان مجرور یان مرفوع کە لەنموونەکان دیارە لەیەکەم خەبەرە بۆتە مرفوع لەدووەم مفعول بە بۆتە منصوب لە سێیەم حرف جری لەپێشە بۆتە مجرورە بەڵام ژمێردراو مادەم مزاف الیە یە هەمیشە مجرورە. وە شتێک بزانە مزاف هەرگیز تنیوین و ال تعریف وەرناگرێت یانی ناتوانیت بڵێیت کتابًا{کتابٍ، کتابٌ} زیدٍ یان الکتاب زیدٍ، بەڵکو هەر دەبێ بڵێیت کتابَ{کتابُ، کتابِ}زیدٍ، وە ئەو مزاف الیە یە مزافەکەش تعریف دەکات معرفة ناسراو زانراو.

(1) **كَتَبْتُ:** فِعْلٌ وَفَاعِلٌ. **البَاءُ:** حَرْفُ جَرٍّ. **قَلَمٍ:** اسْمٌ مَجرُورٌ بِالكَسْرَةِ. **وَاحِدٍ:** صِفَةٌ (قَلَمٍ) صِفَةُ مَجْرُورٍ مَجرُورٌ.

(2) **هذَانِ:** اسْمُ إِشَارَةٍ مُبْتَدَأٌ مَرْفُوعٌ بالأَلِفِ؛ لأَنَّهُ مُثَنًّى. **قَلَمَانِ:** خَبَرٌ مَرْفُوعٌ وَعَلَامَةُ رَفْعِهِ الأَلِفُ؛ لأَنَّهُ مُثَنًّى. **اثْنَانِ:** صِفَةُ (**قَلَمَانِ**) صِفَةُ مَرْفُوعٍ مَرْفُوعٌ.

(3) **اشْتَرَيْتُ:** فِعْلٌ وَفَاعِلٌ. **قَلَمَيْنِ:** مَفْعُولٌ بِهِ مَنْصُوبٌ وَعَلَامَةُ نَصْبِهِ اليَاءُ؛ لأَنَّهُ مُثَنًّى. **اثْنَيْنِ:** صِفَةُ (**قَلَمَيْنِ**) صِفَةُ مَنْصُوبٍ مَنْصُوبٌ.

(4) **كَتَبْتُ:** فِعْلٌ وَفَاعِلٌ. **البَاءُ:** حَرْفُ جَرٍّ. **قَلَمَيْنِ:** اسْمٌ مَجْرُورٌ عَلَامَةُ جَرِّهِ اليَاءُ؛ لأَنَّهُ مُثَنًّى. **اثْنَيْنِ:** صِفَةُ (**قَلَمَيْنِ**) صِفَةُ مَجْرُورٍ مَجْرُورٌ.

## القِسْمُ الثَّالِثُ:

**أَحَدَ عَشَرَ وَاثْنَا عَشَرَ (١١-١٢) (العَدَدُ الـمُرَكَّبُ):** العَدَدُ وَالـمَعْدُودُ مُطَابِقَانِ، وَالـمَعْدُودُ مُفْرَدٌ مَنْصُوبٌ عَلَى التَّمْيِيزِ، نَحْوُ:

لِلـمُذَكَّرِ: أَحَدَ عَشَرَ كِتَابًا. وَاثْنَا عَشَرَ قَلَمًا.

لِلمُؤَنَّثِ: إِحْدَى عَشْرَةَ فَتَاةً. اثْنَتَا عَشْرَةَ امْرَأَةً.

3- یانزەو دوانزە پێیان دەوترێت {العدد المركب}: ژمارەو ژمێردراو وەک یەکن {واتا لەنێرو مێدا ئەو نێر بوو ئەویش نێرە ئەو مێبوو ئەویش مێیە}، وە ژمێردراوەکە تاکە{ئەها لەسەرێ وتمان لە سێ بۆ دەیەکە دایم جمعە لێرە بەپێچەوانەوە هەمیشە بەتاک دێت واتا ناڵێیت أقلام دەڵێیت قلم} وە هەمیشە التمیز ـەو منصوبە.

للمذكر: أحد عشر كتابا، کەواتە ناڵێیت إحدى عشرة كتابا، وەک دەبینن كتابا منسوبە وەک هەمیشەش مەنسوبە چوونکە التمیز ـە وە بە مفردی هاتووە نەک جمع.

للمؤنث: إحدى عشرة فتاة{إحدى بۆ مێیە}، وە اثنتا عشرة امرأة، وەک دەبینن بەهەمان شێوەیە وە عشْرة، سەر {ش} بۆتە سکون بۆ ئاسانکاری سەر زمان.

ئیعرابی:

**إِعْرَابُهُ:** إِعْرَابُ (أَحَدَ عَشَرَ) يَكُونُ بِفَتْحِ الجُزْئَيْنِ، تَقُولُ: (هذَا أَحَدَ عَشَرَ كِتَابًا)، وَ(قَرَأْتُ أَحَدَ عَشَرَ كِتَابًا)[1]، وَ(نَظَرْتُ فِي أَحَدَ عَشَرَ كِتَابًا)، أَوْ (إِحْدَى عَشْرَةَ) لِلمُؤَنَّثِ.

أَمَّا (اثْنَا عَشَرَ)، فَإِنَّ الجُزْءَ الأَوَّلَ مِنْ عَدَدِهِ يُعْرَبُ إِعْرَابَ الـمُثَنَّى، وَالجُزْءَ الثَّانِيَ مِنْهُ مُفْرَدٌ مَنْصُوبٌ، نَحْوُ: (هذَا اثْنَا عَشَرَ كِتَابًا) أَوْ (اثْنَا عَشْرَةَ) لِلمُؤَنَّثِ، وَ(قَرَأْتُ اثْنَي عَشَرَ كِتَابًا) أَوِ(اثْنَتَي عَشْرَةَ) لِلمُؤَنَّثِ، وَ(نَظَرْتُ فِي اثْنَيْ عَشَرَ كِتَابًا)، أَوِ(اثْنَتَي عَشْرَةَ) لِلمُؤَنَّثِ.

ئیعرابی أحد عشر بە فتحی دووبەشە{یانی هەمیشە هەردووک مەبنین لەسەر فەتحە}، واتا لەڕووکەشدا تۆ هەمیشە دەیبینی هەردووکیان أحدَ عشرَ ئاوا فەتحەیان هەیە بەڵام لە ئیعراب{شیکردنەوە} جیاوازدەبن بەپێی دۆخەکە وەکو، هذا احد عشر كتابا، لێرە لە محل رفع دەبێتە خبر، وەبەڵام لێرە قرأت أحد عشر كتابا، لە محل نسبدا مفعول به یە،{واتا وەک ئەوەیە

ئەو یازدەیەت{احد عشر} خوێندبێتەوە ئەگەر ئەو لاببەیت دەبێتە قرأت كتابا{كتێبێكم خوێجدەوە} بەڵام احد عشر هاتۆتە جێی وە بۆیەش بەڕووکەش هەر مەبنیە لەسەر فەتحە چوونکە معرب نییە تا بگۆڕێت بەڵکو مەبنیە. وە بۆ مێینەش ئەینەن شتە ئیعرابەکەی بەس شتەکانی دەبنە هی مێ ئاوا قرأتُ إحدى عشرةَ كتابةً.

إِعْرَابُهُ: إِعْرَابُ (أَحَدَ عَشَرَ) يَكُونُ بِفَتْحِ الجُزْئَيْنِ، تَقُولُ: (هذَا أَحَدَ عَشَرَ كِتَابًا)، وَ(قَرَأْتُ أَحَدَ عَشَرَ كِتَابًا)[1]، وَ(نَظَرْتُ فِي أَحَدَ عَشَرَ كِتَابًا)، أَوْ (إِحْدَى عَشْرَةَ) للمُؤَنَّثِ.

أَمَّا (اثْنَا عَشَرَ)، فَإِنَّ الجُزْءَ الأَوَّلَ مِنْ عَدَدِهِ يُعْرَبُ إِعْرَابَ الـمُثَنَّى، وَالجُزْءَ الثَّانِيَ مِنْهُ مُفْرَدٌ مَنْصُوبٌ، نَحْوُ: (هذَا اثْنَا عَشَرَ كِتَابًا) أَوْ (اثْنَا عَشْرَةَ) للمُؤَنَّثِ، وَ(قَرَأْتُ اثْنَي عَشَرَ كِتَابًا) أَوِ(اثْنَتَي عَشْرَةَ) للمُؤَنَّثِ، وَ(نَظَرْتُ فِي اثْنَيْ عَشَرَ كِتَابًا)، أَوِ(اثْنَتَي عَشْرَةَ) للمُؤَنَّثِ.

بەڵام دوانزدە{اثنا عشر}: بەشی یەکەمی(اثنا) لەحالەتی رفعدا دەڵێیت إثنا وە لە نسب و جردا دەڵێیت إثنَيْ، وە بەشی دووەمی (عشر) تاکەو مەبنیە لەسەر فەتحە: {هذا اثنا عشر كتابا، کە دەبینین نەمان وتی اثني چوونکە خەبەرەو مرفوعە یان اثنا عشرة بۆ مێ} {قرأت اثنتي عشر كتابا، لێرە مفعول بە یە(لێرە اثنتي عشر هەردووک مفعول بە ین بەڵام چوونکە عشر ناگۆڕێ بۆیە واز لەوە دێنین دێینە سەر اثنا، لە نموونەکانی تریشدا وایە.)وە بۆ مێ دەڵێت اثنتي عشرة. ئەوانی تریش دیارن.

[[تێبینی: لەوێنەکەی سەرێ ئەوەی بە ڕەنگی سەوز دەستنیشانم کردووە هەڵە تیای ڕوویداوە لەوێ مەبەستی ئەوەیە ژمێردراوەکە مفردەو مەنسوبە، چوونکە لە 11 تا 19 ژمێردراوەکە مفردە لەسەر التميز چوونکە دەبێتە التميز ]]

القِسْمُ الرَّابِعُ:

ثَلَاثَةَ عَشَرَ إِلَى تِسْعَةَ عَشَرَ (١٣-١٩) (العَدَدُ الـمُرَكَّبُ): الجُزْءُ الأَوَّلُ مِنَ العَدَدِ يُخَالِفُ الـمَعْدُودَ، وَالثَّانِي يُوَافِقُهُ، نَحْوُ:

للـمُذَكَّرِ: ثَلَاثَةَ عَشَرَ كِتَابًا. وَخَمْسَةَ عَشَرَ قَلَمًا.

4- سیانزە بۆ نۆزدە: بەشی یەکەم سەرپێچی ژمێردراو دەکات(واتا جیاوازە لەژمێردراو)، وە دووەم پەسەندی دەکات{وەک ئەوە} خۆ دەزانم هیچ تێنەگەیشتی یانی ئاوا:

خمسةَ عشرَ قلمًا، ئێستا لێره قلم نێره وایه؟ بەشی یەکەم واتا خمسة لەو جیاواز دەبێت(واتا مادەم ئەو نێره ئەو بۆته مێ) وه بەشی دووەم واتا عشر وەک قلم دەبێته مادەم قلم نێره ویش نێره ئاوا.

لِلمُؤَنَّثِ: ثَلَاثَ عَشْرَةَ فَتَاةً. وَخَمْسَ عَشْرَةَ امْرَأَةً.

**إِعْرَابُهُ:** فَالعَدَدُ مَبْنِيٌّ عَلَى فَتْحِ الجُزْئَيْنِ، وَالـمَعْدُودُ مُفْرَدٌ مَنْصُوبٌ عَلَى التَّمْيِيزِ، نَحْوُ: (هذِهِ ثَلَاثَةَ عَشَرَ كِتَابًا)[1]، وَ(اشْتَرَيْتُ خَمْسَةَ عَشَرَ قَلَمًا)، وَ(أَحْسَنْتُ إِلَى خَمْسَ عَشْرَةَ امْرَأَةً).

ثلاث عشرة فتاة، لێره فتاة مادەم مێیه ثلاث بۆته نێر وه عشرة ش بۆته مێی وەک فتاة.

وه ئیعرابەکەی: ژمارەکه مەبنیه لەسەر فەتحی دووبەشی{مەبەست ثلاثَ عشرةَ}، وه ژمێردراوەکەشی مفرەده مەنسوبه لەسەر التمیز، لێره هذه ثلاثة عشر كتابا، ثلاثة عشر دەبێته خەبەر بڵام له ڕووکەش دیار نییه چوونکه وتمان هەردووک مەبنین لەسەر فەتحەبەڵام له ئیعراب دەڵێی، مەبنین لەسەر فەتحی الجزئين فی محل رفع دەبنه الخبر، كتابا التميز ـەو مەنسوبه.
نموونەکانی تریش مەبنین لەسەر فەتحی جزئین بەس بەپێی دۆخەکه دەبینه محل نصب جرد ئنجا مفعول به بێ یان هەرچیبێت.

(1) **هذِهِ:** اسْمُ إِشَارَةٍ مَبْنِيٌّ عَلَى الكَسْرَةِ فِي مَحَلِّ رَفْعٍ مُبْتَدَأٌ. **ثَلَاثَةُ:** خَبَرٌ مَرْفُوعٌ وَهُوَ مُضَافٌ. **كُتُبٍ:** مُضَافٌ إِلَيْهِ مَجْرُورٌ وَعَلَامَةُ جَرِّهِ الكَسْرَةُ.

(2) **قَرَأْتُ:** فِعْلٌ وَفَاعِلٌ. **أَحَدَ عَشَرَ:** عَدَدٌ مُرَكَّبٌ مَبْنِيٌّ عَلَى فَتْحِ الجُزْئَيْنِ فِي مَحَلِّ نَصْبٍ مَفْعُولٌ بِهِ. **كِتَابًا:** تَمْيِيزٌ مَنْصُوبٌ.

---

## وانەی بیست و شەشەم

## تەواوکەری ژمارەکان

## القِسْمُ الخَامِسُ:

**عِشْرُونَ، ثَلَاثُونَ، إِلَى تِسْعِيْنَ (٢٠-٣٠...٩٠) (أَلْفَاظُ العُقُودِ):** يَلْزَمُ هذِهِ الأَلْفَاظُ حَالَةً وَاحِدَةً وَلَا فَرْقَ بينَ مُذَكَّرِهَا وَمُؤَنَّثِهَا، نَحْوُ:

لِلمُذَكَّرِ: ثَلَاثُونَ رَجُلًا. خَمْسُونَ وَلَدًا.

لِلمُؤَنَّثِ: ثَلَاثُونَ امْرَأَةً. خَمْسُونَ جَارِيَةً.

ئەمانە یەک دۆخیان هەیە{یان عشرون یان عشرین}وەلەنێرو مێدا جیاوازی نییە.

لەوێنەکەش دیارە بۆ نێر دەڵێیت

ثلاثون رجلا وە بۆ مێینەش هەر دەڵێیت ثلاثون امرأة جیاوازی نییە.

**إِعْرَابُهُ:** يُعْرَبُ العَدَدُ إِعْرَابَ جَمْعِ الـمُذَكَّرِ السَّالِمِ بِالوَاوِ رَفْعً وَبِاليَاءِ نَصْبًا وَجَرًّا، وَالـمَعْدُودُ مُفْرَدٌ مَنْصُوبٌ، نَحْوُ: (هؤُلَاءِ ثَلَاثُونَ رَجُلًا)[٢] وَ(رَأيتُ ثَلَاثِيْنَ امْرَأَةً)، وَ(وَزَّعْتُ الهَدَايَا عَلَى سِتِّيْنَ طِفْلًا).

ئیعرابەکەی: ژمارەکە وەک جمع مذکر سالم وایە بەواو (ون) لە رفدا وە بە یاء (ین) لەجەرو نصب، وە ژمێردراوەکە مفردەو مەنسوبە وەک 11 تا 19 چوونکە دەبنە التمیز. لێرە هؤلاء ثلاثون رجلا، ثلاثون: خەبەرو مرفوعەو علامەت رفعەکەی واو{و}ـە، وە رأیت ثلاثین امرأة، لێرە ثلاثین مفعول بەیە و منسوبە وعلاماتەکەی یاء ـە.

وە ئەوەش ئیعراب:

(١) هذِهِ: اسْمُ إِشَارَةٍ مَبْنِيٌّ عَلَى الكَسْرَةِ فِي مَحَلِّ رَفْعٍ مُبْتَدَأٌ. ثَلَاثَةَ عَشَرَ: عَدَدٌ مُرَكَّبٌ مَبْنِيٌّ عَلَى فَتْحِ الجُزْئَيْنِ فِي مَحَلِّ رَفْعٍ خَبَرٌ. كِتَابًا: تَمْيِيزٌ مَنْصُوبٌ.

(٢) هؤلاءِ: اسْمُ إِشَارَةٍ مَبْنِيٌّ عَلَى الكَسْرَةِ فِي مَحَلِّ رَفْعٍ مُبْتَدَأٌ. ثَلَاثُونَ: خَبَرٌ مَرْفُوعٌ وَعَلَامَةُ رَفْعِهِ الوَاوُ؛ لِأَنَّهُ جَمْعُ مُذَكَّرٍ. رَجُلًا: تَمْيِيزٌ مَنْصُوبٌ.

6-

## القِسْمُ السَّادِسُ:

**وَاحِدٌ وَعِشْرُونَ إِلَى تِسْعَةٍ وَتِسْعِيْنَ (٢١-٩٩) (الـمَعْطُوفُ عَلَى العُقُودِ):**

تُطَبَّقُ قَاعِدَةُ العَدَدِ الـمُفْرَدِ، تَقُولُ:

لِلمُذَكَّرِ: (وَاحِدٌ وَعِشْرُونَ رَجُلًا). وَ( سَبْعَةٌ وَتِسْعُونَ كِتَابًا).

لِلمُؤَنَّثِ: (إِحْدَى وَثَلَاثُونَ امرَأَةً). وَ(سَبْعٌ وَتِسْعُونَ مَجَلَّةً).

یاساو ڕێسای ژمارەی مفردی تیادا جێبەجێ دەکرێت

للمذكر: دەڵێیت: واحد وعشرون رجلا، واتا لێرە رجلا نێرە وە واحد ـیش نێرە نەمانوت احدى، بەڵام لێرە سبعة وتسعون كتابا، لێرە كتابا نێرە بەڵام سبعة مێیە وەک چۆن لە سێوە تا نۆ وابوو، بەڵام عشرون تسعون وەک خۆیەتی ناگۆڕێت.

للمؤنث: لێرەش بەهەمان شێوەی سەرێ.

وە ئیعرابی:

إِعْرَابُهُ: يُعْرَبُ الجُزْءُ الأَوَّلُ مِنَ العَدَدِ إِعْرَابَ الـمُفْرَدِ، وَالجُزْءُ الثَّانِي يُعْطَفُ عَلَيْهِ وَيُعْرَبُ إِعْرَابَ جَمَاعَةِ ذُكُورٍ، أَمَّا الـمَعْدُودُ فَهُوَ مُفْرَدٌ مَنْصُوبٌ، تَقُولُ: (هؤُلَاءِ ثَلَاثَةٌ وَسَبْعُونَ رَجُلًا)[1]. وَ(رَأيتُ سَبْعًا وَثَمَانِيْنَ فَتَاةً). وَ(مَرَرْتُ بِثَمَانِيَةٍ وَأَرْبَعِيْنَ طِفْلًا).

بەشی یەکەمی ئعرابی المفرد دەکرێت(1-9) واتا عاملی پێش خۆی هەرچی خواست بۆیە فاعل یان موبتەدا یان خبر یان هەرچی، وە بەشی دووەم واوی عطف دەخرێتە سەری وە ئیعرابی جمع مذکر سالم دەکرێت، وە معدود مفردەو مەنسوبە ئەویش تەمیزە، لە 11- 99 هەمیشە تەمیزەو مەنسوبە، هؤلاء ثلاثة وتسغون رجلا، ثلاثة خەبەرو مەرفوعە وە تسعون بەهۆی واوی عطف هەمان ئیعرابی وی دەردەگرێت ویش بۆتە مرفوع چوونکە عەتف دەکرێت بۆسەر سێیەکە.

## القِسْمُ السَّابِعُ:

مِائَةٌ وَأَلْفٌ وَمَا فَوْقَ ذلِكَ (١٠٠، ١٠٠٠..): يُعْرَبُ العَدَدُ إِعْرَابَ الـمُفْرَدِ، وَالـمَعْدُودُ مُفْرَدٌ مَجْرُورٌ عَلَى الإِضَافَةِ، وَلَا فَرْقَ بينَ الـمُذَكَّرِ وَالـمُؤَنَّثِ، نَحْوُ: (هذِهِ مِائَةُ كِتَابٍ)[2]، وَ(قَرَأْتُ مِائَةَ كِتَابٍ)، وَ(كَتَبْتُ فِي أَلْفِ مَجَلَّةٍ).

7- سەتو هەزارو ملیۆنو ئەو شتانە: ژمارەکەی ئیعرابی مفرد دەکرێت یانی بەپێی ڕستەکە ئیعرابی دەکەیت، وە ژمێردراوەکە هەمیشە مفردەو مجرورە چوونکە ژمارەکە دەبێتە مزاف وە ژمێردراوەکە دەبێتە مزاف الیە {وەکو سێ هەتاوەکا دە}، هیچ جیاوازیەک نییە لەنێوان نێروو مێ(یانی هەر دەڵێی مائة یان الف جیاوازی نییە) وەکو: هذه مائة کتاب، هذه اسم اشارەیە وە لە محل رفعدا موبتەدایە وە مائة مزافەو خەبەریشە مرفوعە لە محل رفدا وە خەبەرو مزافیشە، کتابیش لە محل جردا مزاف الیە یەو مجرورە.

ئیعرابەکان:

(١) هؤلاَءِ: اسْمُ إشَارَةٍ مَبْنِيٌّ عَلَى الكَسْرَةِ فِي مَحَلِّ رَفْعٍ مُبْتَدَأٌ. ثلاَثَةٌ: خَبَرٌ مَرْفُوعٌ. وَ: حَرْفُ عَطْفٍ. سَبْعُونَ: مَعْطُوفٌ عَلَى (ثَلاَثَة) وَالـمَعطُوف عَلَى مَرْفوعٍ مَرْفُوعٌ. رَجُلًا: تَمْيِيزٌ مَنْصُوبٌ.

(٢) هذِهِ: اسْمُ إِشَارَةٍ مَبنِيٌّ عَلَى الكَسْرَةِ فِي مَحَلِّ رَفْعٍ مُبْتَدَأٌ. مِائَةُ: خَبَرٌ مَرْفُوعٌ، وَهُوَ مُضَافٌ. كِتَابٍ: مُضَافٌ إِلَيْهِ مَجْرُورٌ.

**تَنْبِيْهٌ:** قَدْ تَدْخُلُ (ال) عَلَى العَدَدِ، وَتَقُولُ: (قَرَأتُ العِشْرِينَ كِتَابًا) وَ(اشْتَرَيْتُ الخَمْسَةَ عَشَرَ قَلَمًا)، وَنَحْوُ ذلِكَ.

تێبینی: وە ال دەچێتە سەر عدد وەک(قرأت العشرين كتابا، ئەگەر بڵێیت عشرين واتا بيست کتێبێکم خوێندەوە نەزانراوە، بەڵام العشرين واتا بیست کتێبەکەم خوێندەوە زانراوە واتا دەیکاتە معرفة کاتێک ال دەچێتە سەر عدد.

## القِسْمُ الثَّامِنُ:

**العَدَدُ التَّرتِيبيُّ (الوَاحِدُ، الثَّانِي، الثَّالِثُ..):** يَتَطَابَقُ العَدَدُ التَّرتِيبِيُّ مَعَ الـمَعْدُودِ (الـمُفْرَدِ وَالـمُرَكَّبِ) تَذْكِيرًا وَتَأنِيثًا، نَحْوُ:

لِلمُذَكَّرِ: الكِتَابُ السَّادِسُ. وَالبَابُ الثَّانِي عَشَرَ.

لِلمُؤَنَّثِ: القَاعِدَةُ الرَّابِعَةُ. الـمَرْأَةُ الثَّالِثَةَ عَشْرَةَ.

8- ژمارەی تەرتیبی {وەکو، یەکەم دووەم سێیەم چوارەم...}، ژمارەو ژمێردراوەکە مرکب بێت یان مفرد پەسندکەری یەکن{موافق} لەنێرو مێدا، وەکو:

للمذكر: الكتاب السادس(کتێبی شەشەم) کتاب نێرەو سادس ـیش هەر نێرە، یان الباب الثاني عشر(دەرگای دوازدەیەم) لێرە دەبینین هەردووک نێرن.

للمؤنث: القاعدة الرابعة، المرأة الثالثة عشرة، وەک دەبینین لێرە مادەم مێیە ویش بۆیە مێ وە هەردوو بەشەکەی واتا الثالثة لەگەڵ عشرة وە بەس بەشی یەکەم ال وەرگرێت هی دووەم نا.

**إِعْرَابُهُ:** يُعْرَبُ العَدَدُ الـمُفْرَدُ صِفَةً وَيأخُذُ إِعْرَابَ الِاسْمِ الَّذِي سَبَقَهُ، تَقُولُ: (هٰذَا بَابٌ ثَامِنٌ)، وَ(قرأتُ البَابَ التَّاسِعَ)[1]، (نَظَرْتُ فِي البَابِ التَّاسِعِ).

أَمَّا الـمُرَكَّبُ فَإِنَّهُ مَبْنِيٌّ عَلَى فَتْحِ الجُزْئَيْنِ، تَقُولُ: (هٰذِهِ القَاعِدَةُ التَّاسِعَةَ عَشْرَةَ)، وَ(رَأيتُ الطَّالِبَةَ الثَّالِثَةَ عَشْرَةَ)[2]، وَ(مَرَرْتُ عَلَى الـمَدْرَسَةِ الحَادِيَةَ عَشْرَةَ) .

ئەگەر تاک بوو لەیەکەوە تا نۆ بوو ئیعرابی ناوی پێش خۆی وەرەگرێت یانی دەبێتە سیفەت بۆ پێش خۆی، لێرە دەڵێیت هذا باب ثامن(ئەمە دەرگای هەشتەمە) لێرە باب خەبەرە مرفوعە وە ثامن دەبێتە سیفەتی ئەو سیفەتی مرفوعیش مرفوعە{واتا باب هەر ئیعرابێ با هەشتەمیش وەک وی دەبوو}،

وە ئەگەر مرکب بوو(پێکەوە لکێنراو){وەکو یازدەو ئەوانە سیو چارو ئەوانە}: ئەوا هەردوو بەشەکەی مەبنی دەبێت لەسەر فەتحەی جزئین(دووبەشی)، تقول(دەڵێیت، یان وەک ئەوەی دەڵێیت): لێرە هذە القاعدة التاسعة عشرة، هذە موبتەدایە قائدة خەبەرەو مرفوعە، التاسعة عشرة دەڵێیت عدد الترتبي مبنين لەسەر فەتحی جزئین، وە لە محل رفعدا دەبێتە سیفەت بۆ ژمێردراوەکە یان ناوەکەی کە بۆی بۆتە سیفەت، واتا لێرە لە محل رفعدا دەبێتە سیفەت بۆ قاعدة کە خەبەرەو مەرفوعە.

---

---

چەند شتێکی گرنگ:

ئائەم پەرتووکە لەچەند ڤیدیۆیەکی مامۆستا مەڕوانەوە وەرگیراوە کە چەند وانەیەکن من نەمتوانی گشتی بکەمێ وەخۆتان دەتوانن بۆی بگەڕێنەوە تا وانەکانی تریش سەیربکەن{زمانی عەڕەبی لەگەڵ مامۆستا مەروان} وە من لە جگە لەوانەکانی ئەو خۆم چەند شتێکم ئامادە کردووە لێرە کەمێک سودی دەبێت بۆتان إن شاء الله.

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ وانەکانی مامۆستا مەڕوان لەدەرسی 27 هەنێک باسی اسم فاعل تفضیل مفعول دەکات وە بەهۆی ئەوەی زۆر پەیوەندی بەنحو نەبوو بەکورتی باسیەکات بەڵام من لێرە بەدرێژی هێناومە کە هەموو شێوازەکانیان چۆن درووستەکرێن بەس باسی چۆنیەتی درووست کردنیانم کردووە دەتوانن بگەڕێینەوە وانەکانی ئەو تا جوانتر تیانبگەن:

جا اسم فاعل(ناوی بکەر) دوو جۆرە یان لە فعلێکی ڕابردووی سێ پیتیەوە دەیکەین یاخود لەغەیری سێپیتی کە ئەویش بەشێوازێکە، وە لە سێپیتیەکە چەند جۆرێکمان هەیە فەرموون:

①- سەرەتا اسم فاعل لەسێپیتی لەسەر ئەم وەزنی [فَاعِل] یانی دەیکەنەی سەر ئەو وەزنە بەڵام کێشەیەک هەیە هەموو جۆرێک بەئاسانی نابێتە ئەمە بۆیە چەند جۆرێکمان هەیە لەسێ پێتی:

1- ئەگەر لەسەر ئەو وەزنە بوو وەک
(نووسی)كَتَبَ،
(کوشت)قَتَلَ،
(دانیشت)جَلَسَ،
(هاویشت)قَذَفَ

ئەوا بەم شێوازەی لێ دەکەین،

(نوسەر)كَاتِبُ،
{بکوژ}قَاتِلُ،
{دانیشتوو}جَالِسُ,
{هاوێژەر}قَاذِفُ
هاوشێوەکانیشیان ئاوا لەسەر ئەو وەزنە بوون ڕێک ئاوای لێدەکەیت.

2- وە ئەگەر پیتی ناوەڕاستی ئەلف بوو(ا) لەسەر ئەم شێوازە دەیکەت، نموونەش
{وتی}قَالَ،
{سەرکۆنەکرد-سەرزەنشتکرد}لَامَ،
{نووست}نَامَ،
{نەرم بوو}لَانَ

ئاوایان لێ دەکرێت

(قسەکەر)قَائِلُ،

{سەرکۆنەکەر-سەرزەنشتکەر}لَائِمُ،
{نوستوو}نَائِمُ.
{نەرم}لَائِنُ
وە ئەوانی تریش کە هاوشێوەی ئائەمانەن.

3- وە ئەوانەی کە پیتی کۆتاییان حرف عللەیە، وەکو ئەلفی مەقسورە(ى) یاخود ئەمەیان(ا) نموونەش:
{بانگ کرد}دَعَا،
{هاویشت}رَمَى،

ئا ئاوایان لێ دەکەین،

{بانگکەر}دَائِي،
{هاوێژەر}رَامِي،

وە دواتر ي ـەکە لادەبەین تنوین کەسرە لەشوێنیان دادەنێین ئاوا، دَاعٍ، رَامٍ، بەڵام لەهەندێک حالەت کدا وەک خۆی دەینوسینەوە بەتاییەت ئەگەر ال ـامی تەعریفیان پێوەبوو، ئاوا الدَاعِي الرَامِي. وەهاوشێوەکانیشیان بەهەمان شێوە. وەبۆ سڕینەوەی ي ـەکە ئەگەر وشەکە بەتەنهابوو پێویستەکات بیسڕیتەوە بەڵام ئەگەر هاتوو لەناو ڕستە پاشگرێک یان پێشگرێکی پێوەبوو ئاساییە نەیسڕیتەوە، مەبەستیان ئەمەیە نموونە، دَاعِيًا یان الدَاعِي، یان دَاعِية، تاء مربوتة مان بۆ زیاد کرد بەڵام لەهەموو دۆخەکاندا اسم فاعله، بە ي وە بێویشت.

4- ئەگەر هەمزەکە کەوتە سەرەتا یان کۆتایی یان ناوەڕاست لەسێپیتی،

وەکو
أَكَلَ{خوارد}: ئەگەر وابوو هەمزەکەی دەکەینە هەمزەی مد، (آ)، آكِل{خواردوو}

سَأَلَ{داواکرد-پرسیار کرد}: ئەمەیان ئاوا لێدەکەین سَائِلُ{داواکار-پرسیارکەر}

قَرَأَ{خوێندەوە}: لەمەیان هەمزەکە دەگۆڕینە ئەم جۆرە هەمزەیە(ئ) ، ئاوا: قَارِئُ{خوێنەر}

5- ئەگەر فعلی سێپیتی ئاوابوو،

{درێژکردەوە}مَدَّ،
{گومانی کرد-گومانی برد}ظَنَّ،
{تێپەڕبوو}مَرَّ،

ئەمانە دوو پیتین بەڵام هی کۆتاییان شەددەی لەسەر بۆیە لەزمانی عەرەبیا حیسابی سێپیتی بۆ دەکرێت، چوونکە شەددە حیسابی دوو پیتی بۆ دەکرێت، جا ئاوایان لێ دەکرێت:

{درێژکەر}مَادُّ،
{گومانکەر-گومانبەر}ظَانُّ،
{تێپەڕیو}مَارُّ.

②- ئەمە سێ پیتی تەواو جا کاتی چواریە ئەو یەک هەنگاوەو تەواو بەم شێوەیە: سەرەتا کارە ڕابردووە جگە لە سێپیتیەکە دێنین دەیکەینە ڕانەبردوو ئنجا پیتی ڕانەبردووەکە لادەبەین(مەبەستمان {أنیت} ـوە) وە {مُ} ـێک کە ضەممەی لەسەر بێت دەخەینە جێ وە پیتی پێش کۆتایی دەکەینە کەسرە، قورسە ئاوا تێبگەن بەس بەنموونەکان تێدەگەن فەرموون:
اِسْتَخْرَجَ{دەرهێنا}، کە کارێکی ڕابردووە دەیکەینە ڕانەبردوو ئاوا یَسْتَخْرِجُ{دەردەهێنێ}، وە وتمان (أنیت) دەسڕینەوە (مُ) ـێک دەخەینە جێیان بە زەممەوە وە پێش کۆتایی دەکەینە کەسرە، بەم شێوەیەی لێدێت، مُسْتَخْرِجُ{دەرهێنەر}.
نموونەیەکی تر

اِخْتَرَعَ{درووستردـئافراند-داهێنا}، یَخْتَرِعُ{درووست دەکات- دەئافرێنی-دادەهێنێ}،
مُخْتَرِعُ{درووستکار- ئافرێنەر- داهێنەر}،

یەکی تر أَخْرَجَ{دەرکرد}، یُخْرِجُ{دەردەکات}، مُخْرِجُ{دەرکەر}.

وەشتێک بزانن کۆتاییەکانیان بەپێی عواملەکان و حالەکان دەگۆڕێت یانی کاتب شەرت نییە دایم زەممە بێت لەوەیا مەنسوب بێت یان مجرور ئیتر ئاوا وە ئەوانی تریش.

## اسم مفعول:

له اسم فاعل ئەگەر سەیری بکەین بەعەقڵ هەستەکەین کەسەکە وەک بڵێی هەستاوە بەکارەکە بەڵام لەشێوەی اسم، کاتێک دەڵێی کاتب نوسەر واتا کەسێک شت دەنوسێ کە ئەمە فاعلە یاخود نائم نوستوو  کە دەبینین وەک بڵێین فاعلێکە لەشێوەی اسم بۆیەش ناونراوە (ناوی بکەر) واتا ئەو کەسەی هەڵدەستێ بەکارەکە کێ هەڵدەستێ بەکاری نوستن؟ نوستوو، ئەی کێ هەڵدەستێ بەکاری نوسین؟ نوسەر، ئەی کێ هەڵدەستێ بەکاری درووست کردن؟ درووستکار، مەبەستەکە ئەوەیە بەڵام لە اسم مفعول ڕێک پێچەوانەیە ئەو کەسەی کارەکەی لەسەر کراوە، واتا نموونە کێ هەڵدەستێ بەکاری کوشتن؟ قاتل(بکوژ) ئەی بکوژ کارەکە لەسەر کێ دەکا یان کێ دەکوژرێ کوژراو(مقتول) ئاوا

جاچۆن اسم فاعل لەسەر وەزنی فَاعِل بوو بەهەمان شێوە اسم مفعول یش لەسەر وەزنی مَفعُول ـە، وە اسم فاعل لە مبنی لمعلوم درووستەکرا بەڵام اسم مفعول لە مبنی لمجهول درووستەکرێت

1- ئەگەر سێ پیتیبوو ڕاستەوخۆ دەیخەینە سەر وەزنی مفعول، ئاوا
قَتَلَ{کوشتی}--->قُتِلَ{کوژرا} دێنین --->مَقْتُولُ {کوژراو}
سَمِعَ{بیستی}--->سُمِعَ{بیسترا}---> مَسْمُوعُ{بیستراو}
دەشتوانی هەریەکسەر بێ ئەوە بیکەیە مەجهول بیکەیتێ بەڵام شتێکت لەبیر نەچێ کە کاتێک واتاکەی دەکەیتە کوردی ئەو مجهول کردنە لەناو مێشکی خۆت بکە دوایی لەخواری بەڕەنگی سەوز ڕوونتری دەکەمەوە.

حّكَمَ{بڕیاریدا}--> حُكِمَ {بڕیاردرا}مَحْكُومُ{بڕیاردراو}
عَلِمَ{زانی}-->عُلِمَ{زانرا}-->مَعْلُومُ{زانراو}
كَتَبَ{نوسی}-->كُتِبَ{نوسرا}-->مَكْتُوبُ{نوسراو}

ئەوانی تریش کەئاوا لەسەر ئەو وەزنانەن ئاسانە کردنیان بەڵام وەک اسم فاعل هەیە جیاوازە:

2- مُعتَل الوسط(واتا پیتی ناوەڕاستی ا بێ): سەرەتا دەیکەیە مزارع وەکو
قال، باع

ئێستا
قال دەیکەیتە مزارع یقول، (انیت) لادەبەیت قول، مَقُول
باع بیکەیە مزارع دەبێتە یبیع، ویش لاییبە بیع، مَبِیع

3- معتل الآخر(واتا پیتی کۆتایی حرف علە بیت): لێرەش دەیکەیتە مزارع وە لێرە شتێک ئاسانترە ئەگەر ئەلفەکەمان ئەلفی مەقسورە بوو مەبەست ئەمەیە (ی) ئەگەر گۆڕیمان دایم دەبێتە یاء(ي) وە ئەگەر ئەلفی ممدودە بوو (ا) دەبێتە واو (و).

رمى-->يرمي--> مَرميٌّ
دعا يدعو-->مَدعوٌّ
وەلێرە لەکاتی گۆڕین پیتی کۆتایی شەددەیەکی دەخەیتە سەر وە ئایا مرفوع دەبێت یان ئەوانی تر بەپێی دۆخی ڕستەکە دەگۆڕێت دەبێت ئەوانە بزانن.

4- مضعف(دوو پیتی بێ پیتی کۆتایی شەددە بێ):
لێرە شەددەکە دەبێت لاببەیت و پیتەکەش بگەڕێنیتەوە

مدّ--> مَدَدَ-->مَمدُود
ظنّ-->ظنن-->مَظنُون
ردّ-->ردد-->مَردُود
منّ-->منن-->مَمنُون

4- ئەوەش سێجۆ هەمزەکەیە

أَكَلَ-->مأْكُولُ

سَأَلَ-->مَسؤُولُ

قَرَأَ-->مَقرُء

②- چوار پیتی: مُ دادەنێین لەجێی( انیت)پیتی پێش کۆتایی دەکەینە فەتحە.

اِنطَلَقَ--> يَنطَلِقُ--> مُنطَلَقُ
اِستَخرَجَ--->يَستَخرِجُ--->مُستَخرَجُ

كَبَّرَ{گەورەکرد}-->يُكَبِّرُ{گەورە دەکات}--->مُكَبَّرُ{گەورەکراو}

تۆ یاساکانی چۆنیەتی درووست کردنیت زانی وەبشزانە بۆ دەرکردنی واتاکەی کە کتب م کردە مکتوب ئەی چۆن بزانم واتاکەی بەکوردی دەبێتە چی

ئەویش دێینە سەر ڕێزمانی کوردی کە بەدرێژی باسی ناکەم، مبنی لمجهول لەکوردی بە کاری بکەر نادیار ناودەبرێ[ئەگەر ڕوون نەبوو دەتوانی بۆی بگەڕێیتەوە] ئەویش ئاوایە

لەکاری ڕابردوو کۆتاییەکەی {را} زیاد دەکەین وە بەپێی وشەکەش جاری وایە هەنێ پیت دەسڕینەوە وەک چۆن لە زمانی عەرەبیەکەش بەپێی وزنەکەی یاساکان دەگۆڕێن لەکوردیش وایە، وە لە ڕانەبردووش {ڕێ} کە مەسەلەکەمان لەسەر ڕابردووە بۆیە ناچینە سەر ئەو.

[کاری بکەر دیار]: نوسی-->نوسرا [کاری بکەر نادیار]
کری--->کرِدرا
کوشت-->کوژرا
برد--->بردرا
دزی-->دزرا
هەڵگرت-->هەڵگرترا
دانا-->دانرا
جا سەیر بکەن کە تۆ قَتَلَ کرتە قُتِلَ کە سەرەتا واتا کوشتی دواتر واتا کوژرا، کە تۆ کرتە اسم مفعول ئاوا مقتول ئەگەر بتەوێ واتاکەی بکەیە کوردی ئاوا دەیکەیە بکەر نادیار دواتر یەک واو لەکۆتایی دادەنێی زۆربەی ئاوا دەکرێت

مَقتُول-->کوژراو
مَکتُوب-->نوسراو
مَقُول--> وتراو

کە قُتِلَ واتا کوژرا مقتول واتا کوژراو، ئاوایە ئەوانی تریش زۆربەی یەک واو بخە کۆتایی کاری بکەر نادیارەکە لەزۆربەی ئاوا واتاکەیت بۆ دەرەچێت إن شاء الله. [دەبێ بچن باش خۆتان فێرە مبنی للمجهول ومعلوم بکەن لە فعل دەنا لەو مەسەلەیە تێناگەن و ئاڵۆز دەبێت لاتان قورسیش نییە بەس جیاوازیەکەی ئەویش گۆڕینی هێماکانە هەنێ جار جیاوازتر بەهۆی جۆر و وەزنەکان نموونە قال یانی وتی(معلومە{زانراوە}) قیل یانی وترا{مجهولە، نەزانراوە}، وە لە کوردی کە پێیەڵێن کاری بکەر نادیار واتا بکەرەکە دیار.

## اسم التفضيل:

اسم التفضيل بەکوردی واتا پلەی بەراورد(باشترو چاکترو بەهێزترو جوانتر و خێراتر)

پێناسەکەی ئەوەیە دوو کەس لە سیفاتێک بەژدارن بەڵام دانەیەکیان زیاتر ئەو سیفاتەی تیایە نموونە،
أنتَ أحسَنُ مِنهُ، تۆ باشتریت لەئەو، کەواتە ئەو باشە بەڵام تۆ باشتریت.

وە لە فعل درووستەکرێت بەڵام هەموو جۆرێک نا وە ئەوانەی کە لێی درووست ناکرێن ئەمانەن:

1- الفعل الجامد:(لَیسَ، نِعمَ،بِئسَ)

2- ئەوانەی پلەی بەراوردیان تیا نییە: {مَاتَ، غَرَقَ(خنکان)، دَخَلَ)

3- دەبێ سێ پیتی بێت، عَلِمَ دەبێت بەڵام عَلَّمَ نابێت.

4- دەبێت المتصرف بێت واتا جەماعەتی جامد نەبێت لیس و نعم و بئس.

5- دەبێت معلوم بێت عَلِمَ، واتا نابێت مجعول بێت عُلِمَ.

6- دەبێت التام بێت واتا الناقص نەبێت بەتایبەت(کان واخواتها)

7- نابێت ئاداتی نەفی لەپێش هاتبێت (مَا عَلِمَ)

8- دەبێت پلەی بەراوردی تیابێت.

9- نابێت ڕەنگەکان بن(حَمِرَ)، وە عیب (عَرِجَ)، وە حلیة (کَحِلَ)

